حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# پـــرۆگـــرامـــی
# پەروەردەی وەرزشـــی

## بۆ پۆلی دەیەمی ئامادەیی

ئامادەکردنی

لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە

چاپی چوارەم ٢٠١٥ زایینی ٢٧١٥ کوردی ١٤٣٦ کۆچی

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

## ( پێشەکی )

قوتابیان و خوێندکارانی ئازیزو خۆشەویست.............................

ئەم بەرهەمەی کەئامادەکراوە لەلایەن سەرپەرشتیارانی وەرزشی دیارییە بۆئێوەی بەرێز کەکاری لەسەریکەن وەببێتە بەرنامەی ئەم قۆناغە کەبۆشاییەك هەبووە لەم بوارە لەپێناو بەرەو پێشوە چوونی یارییە رێکخراوەکان ئینجا چ لەرووی تەکنیك وتەکتیك بێت یالە رووی یاساکان بێت وەبەهۆی بەرەو پێشوە چوونی بەردەوامی یاری تۆپی سەبەتە و تۆپی بالە و خێرایی بەرەو پێش چوونەکە بەباشمان زانی کە بۆ ئەم قۆناغە ئەم بابەتانە بخەینە بەردەستتان بۆگەیاندنی بەقوتابیان و ئاشناکردنیان بەیاساکانی هەردوو یاری تۆپی سەبەتەو بالە کەپێشکەوتنی بەرچاوی هەیە لە جیهان وگەیشتۆتە سەرەوەی هەرەم لەیاری کردن و بەرێوەبردنی لەلایەن داوەرانی بەتوانا٠وەبابەتەکانی ئەم پەرتوکە دواترین گۆڕانکاری و زانیارییەکانی نێودەوڵەتین کە کاری پێ دەکرێت ٠بۆیە بایەخدان بە وەرزشی قوتابخانە ئەرکێکی پیرۆزە کەمامۆستای وەرزشی هەوڵی بۆ دەدات لەناو قوتابخانە وبەبەشداری کردن لەچالاکییەکان وەبە پەیڕەو کردنی یاساکانی ئەم یارییانە وەشی کردنەوەیان ئێمەش بێ بەش نابین لەم پێش کەوتنە وەئامانجی وەزارەتی پەروەردە و ئامادەکەرانی ئەم بەرهەمە پێشکەوتنی وەرزشە لەقوتابخانە و گەیاندنیەتی بەئاستی وولاتانی پێشکەوتوو لەم چەرخە نوێیە کە وەرزش بۆتە ئامرازێکی بەتین کردنی پەیوەندییەکان لەنێوان گەلان وەجێ بەجێکردن و بایەخدان زیاتر دەبێتە هۆی تێرکردنی ویست و ئارەزووەکانی قوتابیان و خوێندکاران لەم بابەتە گرنگە وەهۆی سەرەکی پێشکەوتنی وەرزشە لە قوتابخانە لە کۆتایی زۆر سوپاسی هەموو ئەم بەرێزانە دەکەین کە هەوڵیان داوەو ماندووبوون بۆ ئامادەکردنی ئەم پەرتوکە و بەتایبەتیش وەزارەتی پەروەردە کە هەمیشە بواری رەخساندووە بۆ هەموو کەسێك و پشتگیری بەردەوامی نیشان داوە لەپێناو بەرەو پێش چوونی پەروەردەی وەرزش لەهەرێمی کوردستان٠

# بــەشــی یــەکــەم
# پوختەیەک لەیاسای یــاری تۆپــی سەبەتە



# یاساکانی تۆپی سەبەتە

## بەندی -١- پێناسە :

یاری سەبەتە لەنێوان دوو تیپ دەکرێت هەرتیپێک لە (١٢) یاریزان پێکدێت وە پێنج یاریزان لەناو یاریگادا یاری دەکەن. ئامانجی هەرتیپێک ئەوەیە کەوا لە سەبەتەی تیپی بەرامبەر خاڵ تۆماربکات. وە نەهێڵێت تیپەکەی تر خاڵ تۆماربکات لە سەبەتەکەی ئەو.

### (١-١) سەبەتە :

ئەو سەبەتەی کەهێرشی دەکرێتە سەر دەبێتە سەبەتەی تیپی بەرامبەر. ئەو سەبەتەی بەرگری لێ دەکرێت دەبێتە سەبەتەی تایبەت بە تیپەکەی.

**(١-٢) براوەی یاری:** ئەو تیپەی زیاترین خاڵ تۆمار بکات لە کۆتایی یاری بە براوە یارییەکە دادەنرێت.

## بەندی -٢- پێوانەی یاریگا :

یاریگا دەبێت لاکێشە بێت دوور بێت لە هەر بەر بەستێك لە یارییە نێو دەوڵەتیەکاندا دەبێت درێژی یاریگا (٢٨م)بێت وە پانیشی (١٥م)بێت. لە لێواری ناوەوەی هێڵی سنوورەکانەوە دەپێورێت. وەیەکێتی وولاتەکان دەستەڵاتی هەیە پشت بەگۆرەپان ببەستێت کە کەمترین درێژی لە (٢٦م) کەمتر نەبێت وە پانیەکەشی لە (١٤م)کەمتر نەبێت. سەیری وێنەی ژمارە (١) بکە

### (٢-١) هێڵەکان : Lines

پێویستە هێڵەکان بە یەك رەنگ بێت باشترە (سپی) بێت وە بە پانی (٥سم) و وە بە باشی دیار بن.

### (٢-٢) هێڵەکانی تەنیشت و کۆتایی :

پێویستە گۆرەپانی یاری دیاری بکرێت بە (دوو) هێڵی کۆتایی و هێڵی تەنیشت. وە ئەم هێڵانە بەشێك نین لە گۆرپانی یاری. و ئەم هێڵانە دەبێت بەلایەنی کەم (٢م) دور بێت لە هەر بەر بەستێك وە لە شوێنی دانیشتی تیپ.

### (٢-٣) هێڵی ناوەند : (خط المركز)

هێڵی ناوەند: هێڵێکی وێنە کێشراوە تەریبە لەگەڵ هێڵەکانی کۆتایی لە خاڵی ناوەندی هێڵی تەنیشت و بە درێژی (١٥سم) لە دەرەوەی هێڵی تەنیشت درێژبۆتەوە.

### (٢-٤) بازنەی ناوەند : (الدائرة المركزية)

بازنەی ناوەند لە ناوەندی گۆرەپان دەکێشرێت بە نیوە تیرەی (١٨٠)سم دەپیورێت لە لێواری دەرەوەی چێوەی بازنەکانی تری ناو گۆرەپان بە نیوەتیرەی (١٨٠)سم دەپیورێت لە لێواری دەرەوەی چێوەی بازنەکە. وە چەقی ناوەراستی لە سەر خاڵی ناوەندی هێڵی هەڵدانی سەربەست (وێنەی ژمارە -١-)




وێنەی ژمارە (١)
یاریگای تۆپی سەبەتە

## ( ٢-٥ ) هێڵی هەڵدانی سەر بەست و ناوچە قەدەغە کراوەکان :

پێویستە هێڵی هەڵدانی سەربەست تەریب بێت (موازیا) لەگەڵ هێڵی کۆتایی. بە دووری (٥٨٠سم) لەگەڵ لێوەری ناوەوەی هێڵی کۆتایی دوورە. وە ناوچەی قەدەغە کراو ئەو رووبەرە دیاری کراوەیە لە ناو گۆرەپان لە نێوان هێڵی کۆتایی و هێڵی هەڵدانی سەربەست و دوورە لە لێواری دەرەوەی خاڵی ناوەند لە هێڵی کۆتایی بە (٢,٤٥)م لە هەر دوو تەنیشتی. سەیری وێنەی ژمارە (٢) بکە.

## ( ٢-٦ ) ناوچەی تۆمار کردنی ( سێ )خاڵی :

ناوچەی تۆمارکردنی گۆلی مەیدانی (٣) خالی تیپ بریتیە لە هەموو رووبەری زەوی ناوچەی گۆرەپانی یاری جگە لەو ناوچەیەی کە نزیکە لە سەبەتەی بەرامبەر کە سنوور دارە بریتیە لە :

- دووهێڵی تەریب کە لە هێڵی کۆتاییەوە درێژ بوونەتەوە (٠,٧٥)م دوورن لە هێڵەکانی تەنیشتەوە.
- نیو بازنەیەك کە (٦,٧٥)م لە چەقەکەیەوە تاکو لێواری دەرەوەی پێوراوە (هەمان خاڵی دیارکراوی سەرەوەیە) لەو خاڵە ستوونییەی کە راستەوخۆ لە سەبەتەی رکابەرەوە دەکەوێتە سەر زەوی . وە دووری لەم خاڵەوە تاکو لێواری ناوەوەی خاڵی ناوەڕاستی هێڵی کۆتایی (١,٥٧٥) م . نیوە بازنەکە لەگەڵ دوو هێڵە تەریبەکان بەیەك دەگەن ( وێنەی ژمارە (١)).




وێنەی ژمارە ( ٢ )
وێنەی ناوچەی قەدەغەکراو و هێڵی هەڵدانی
سەر بەست (الرمية الحرة)




وێنەی ژمارە (٣)

## بەندی -٣- کەل و پەلەکان Equipment:

پێویستە لە کاتی ئەنجام دانی یاری تۆپی سەبەتە ئەم کەل وپەلانەی کە تایبەتە بە یارییەکە دابین ( دەستەبەر ) بکرێن :ـ:

١. یەکەکانی راگیرکردنی دواوە کە بریتین لە :

- بۆرد/لە دوو داری توند دروست دەکرێن (لوحة)
- سەبەتە/ کە دوو رینگی ئاسنی نەرم لەگەڵ تۆری پێ بەستراوە.

٢. تۆپی سەبەتە

٣. کات ژمێری یاری

٤. تابلۆی ئەلکترونی تۆمار (لوحة تسجيل)

٥. ئامێری-٢٤- چرکە
٦. کات ژمێری هەژماردنی کاتی دابراو وە کاتژمێرێکی کات وەستاندن یان ئامێرێکی بینراو.
٧. دوو ئامێری دەنگی بەهێز لە رووی دەنگ جیاوازیان هەبێت.
٨. فۆرمی تۆماری یاری
٩. نیشانەی هەڵەی یاریزان
١٠. نیشانەی هەڵەی تیب
١١. هێمای (تۆپ لەلا بوون بە نۆرە (الحیازە المتبادلە)
١٢. رووناکی تەواو.
١٣. گۆرەپانی یاری.

## بەندی -٤- تیپ Teams :

### ( ٤-١ ) پێناسە :

تیپ پێك دێت لە هەموو ئەو یاریزانانە و راهێنەر و یاریدەدەری راهێنەر و ئەندامانی تیب و ئەوانەی کە ناویان هاتووە لەلیستی تیپدا.

### ( ٤-٢ ) تیپێك پێك دێت لە :

١. لە (١٢) یاریزان کە تیایدا یاریزانێك سەرۆکی تیپە( کابتن).
٢. راهێنەر، ی/راهێنەر ئەگەر بە ویستی تیب بوو.
٣. پێنج هاوکارانی تیپ کە لە شوێنی یەدەکەکانن ئیشی تایبەتی خۆیان هەیە نمونە (بەرێوەبەر، پزیشك، چارەسەرکەر، ئامار، وەرگێر...)

### ( ٤-٣ ) :

پێویستە (٥) پێنج یاریزان ئامادەبێت بۆ یاری کردن لە ناو یاریگادا لە سەرەتای دەست پێکی یاریدا وە دەتوانرێ بگۆرێن لە کاتی یاری بە پێ ی یاسا.

### ( ٤-٤ ) جل و بەرگی یایزانان : Uniforms

جل و بەرگی یاریزان پێك دێت لە

١. فانیلە دەبێت یەك رەنگ بێت لە دواوە و پێشەوە، وەپێویستە کوران و کچان فانیلەکانیان لە ناو شۆرتدا بێت لە کاتی یاریدا.
٢. شۆرت پێویستە یەك رەنگ بێت لە پێشەوە و دواوە مەرج نیە لە هەمان رەنگی فانیلە بێت.
٣. نابێت فانیلەی بێ قۆل لە ژێر فانیلەی یاری لەبەر بکرێت. تەنها بە رەزامەندی پزیشکی.

## ( ٤-٥ ) پێویستە ژمارەکان روون بێت لە سەر فانیلە بەم شێوەیەی خوارەوە :

١. دەبێت ژمارەی دواوەی فانیلەکە لە (٢٠)سم کەمتر نەبێت

٢. دەبێت ژمارەی پێشەوەی سەر فانیلەکە (١٠)سم کەمتر نەبێت.

٣. پانی ژمارەی یاریزان لە (٢)سم کەمتر نەبێت.

٤. ژمارەی یاریزان لە (٤-١٥)دەبێت بەڵام هەر تیپێك دەتوانیت (٢)ژمارەی تر دابنێت بە مەرجێ لە نێوان (١٦-٩٩)بێت.

٥. ناتواندرێت یاریزانێك هەمان ژمارەی یاریزانێکی هاورێی بەکار بهێنێت لە هەمان یاریدا.

٦. ئەگەر هەر ریکلامێك هەبوو لە سەر فانیلە پێویستە (٥)سم دوور بێت لە ژمارەکان.

٧. لە ئێستادا ژمارەی (0+ 0+ 1+ 2+ 3) بۆ ژمارەی یاریزانان زیادکراوە.




وێنەی ژمارە (٤)

## ( ٤-٦ ) ئەو شتانەی رێگە پێ نەدراون بۆ یاریزان :

١. پارێزەری پەنجەکان، دەست، مەچەك، شان، ئانیشك، ئەمانە هەموو رێگە پێنە دراون بە مەرجێك دروست کرابێت لە (ئاسن، پێست، پلاستیك) وەهەر ماددەیەکی تر کە رەق بێت تەنانەت ئەگەر بە بەرگێکی نەرمیش روپۆش کرابێت.

٢. ئەو ئامێرانەی کە دەبێتە هۆی بریندار کردن، وە دەبێت نینۆکی پەنجە کانیش کورت بکەینەوە.

٣. ئامرازەکانی سەر خشڵ و جوانکاریی .

## ( ٤-٧ ) ئەو شتانەی رێگە پێ دراون بۆ یاریزان :

١. کەل و پەلەکانی پارێزگاری لە (شان، قۆل، ئانیشك) بەشی خوارەوەی قاچ (قولە پێ) ئەم کەل و پەلانەی دەبەسترێت ئەگەر پارێزراوبێت بە شێوەیەك کە نەبێتە هۆی برینداری یاریزانی بەرامبەر.

٢. هاوکاریی کردنی ئەژنۆکان ئەگەر بە شێوەیەکی جوان روپۆش کرابێت بە ماددەیەکی نەرم.

٣. ئامێری پارێزگاری لە لووتی شکاو ئەگەر دروست کرابێت لە ماددەیەکی رەق.

٤. چاویلکە ئەگەر یاریزانەکانی بەرامبەری نەخستە مەترسیەوە وە لەسەر لێپسراوێتی خۆی بوو.

٥. بەستەری سەر نابێت لە (٥)سم پان تربێت لە قوماش دروست کرابێت ماددەیەك بێت نەبێتە هۆی برینداری یاریزانان.

## بەندی -٥- یاریزان- پێکان : Players Injury

(٥-١) لەکاتی پێکانی یاریزان، داوەر دەتوانێت یاری رابگرێت.

(٥-٢) ئەگەر هاتوو تۆپ زیندوو بوو یاریزان توشی پێکان هات پێویستە داوەر یاری رابگـــرێت و راهێنەر ، ی.راهێنەر، یاریزانان ، ئەندامانی تیپ دەتوانن بچن بۆ ناو یاریگا بەمەرجێ داوەر رێگایان پێ بدات و بۆ سەلامەتی یاریزان لەم کاتەدا و لەکاتی هاتنە ناوەوەی ئەمانە دەبێت یاریزان بگۆرێت.

(٥-٣) لە دوای ئەوەی یاری وەستێندرا دەبێت تا (١٥)چرکە چاوەرێی یاریزان بکەین دواتر دەبێت بچێتە دەرەوەی یاریگا بگۆردرێت.

(٥-٤) پزیشك دەتوانێت بچێتە ناو یاریگا بەبێ رەزامەندی داوەر ئەگەر زانی یاریزانەکە پێویستی بە چارەسەرە کاتێك کە پزیشك هاتە ناو یاریگا دەبێت یاریزانەکە بگۆرێت.

(٥-٥) ئەگەر یاریزان هەڵدانی سەربەستی بۆ هەژمارکر بە هۆی پێکان نەیتوانی جێبەجێ ی بکات. یاریزانی یەدەگی شوێن گرتووی هەڵدانەکە جێ بە جێ دەکات.

(٥-٦) ئەگەر یاریزان بریندار بوو یان خوێن بیندرا بەهەر شوێنێکیەوە پێویستە بچێتە دەرەوە تا چارەسەری بۆ دەکرێت پاش چارەسەر کردن دەتوانێت بێتەوە ناو یاریگا.

(٥-٧) دەتوانرێت یاریزان بگۆردرێت ئەگەر یاریزان ئامادەبێت بۆ گۆران پێش ئەوەی یاریزانەکە توشی پێکان بێت تیپی بەرامبەر ئەتوانن لە هەمان کاتدا گۆرانکاری بکەن ئەگەر ویستیان.

## بەندی -٦- سەرۆکی تیپ (کاپتن) ئیش و کاری و دەسەلاتی :

(٦-١) سەرۆکی تیپ ئەو یاریزانەیە کەنوێنەری یاریزانەکانە لە ناو یاریگادا دەتوانێت پەیوەندی بکات بەداوەرەوە لە کاتی یاری زانیاری پێ بدات لە کاتی وەستانی یاری و کاتژمێری یاری وەستاو بێت.

(٦-٢) سەرۆکی تیپ دەتوانێت ئیش و کاری راهێنەر بکات ئەگەر نەبوو یان کرابووە دەرەوە.

(٦-٣) سەرۆکی تیپ دەتوانێت لە کۆتایی یاریدا رەخنە (اعتراض)بگرێت لە تیپی بەرامبەر بە مەرجێك واژوو لەسەر فۆرمی یاری بکات.

## بەندی -٧-راهێنەران

## ئیش و کاری و دەسەلاتی :

(٧-١) پێویستە لە سەر راهێنەر یان ئەو کەسەی هەڵدەستێت بە ئیش و کاری راهێنەر بە ئامادەکردنی لیستێك بە ناوی تەواوی یاریزانان و ژمارەیان و سەرۆکی تیپ و راهێنەر و یاریدەدەرەکەی پێش (٢٠)خولەك لە دەست پێکی یاری پێشکەش بە تۆمارکەری یاری بکات.

(٧-٢) پێش دەست پێکردنی یاری بە (١٠)خولەك دڵنیا بێتەوە رازی بێت بە ناوی یاریزانان و ژمارەیان و هەموو ئەندامانی تیپ وراهێنەر وە لە هەمان کاتدا واژوو بکات لەسەر فۆرمی تۆمار وە لە هەمان کاتدا (٥) یاریزانە سەرەکیەکیان دەست نیشان بکات، دەبێت ئەم کارە یەکەم جار تیپی (أ) ئەنجامی بدات.

(٧-٣) راهێنەر یاریدەدەری راهێنەر (ئەو ئەندامانەی ناویان نوسراوە) بۆیان هەیە لە شوێنی یەدەگ دابنیشن ئەگەر ناویان نەبێت ناتوانن لەگەڵیان دابنیشن.

(٧-٤) راهێنەر یان یاریدەدەری راهێنەر ئەوان نوێنەری تیپن بۆیان هەیە راستەوخۆ پەیوەندی بکەن بە مێزی تۆمارەوە بۆ زانینی کاتی یاری، بە مەرجێك تۆپ مردوو بێت. کاتی یاری وەستا بێت.

(٧-٥) تەنها راهێنەر دەتوانێت بە پێوە بوەستێت زانیاری بدات بە یاریزانەکان ئەویش لە شوێنی دیاری کراوی خۆی. یەکێك لە راهێنەر یان یاریدەدەرەکەی.

(٧-٦) ئەگەر هاتوو یاریدەدەری راهێنەر ناوی هەبوو لە فۆرمی تۆمار پێش یاری (واژووی پێویست نیە) ئەتوانێت ئیش و کارەکانی راهێنەر بکات ئەگەر راهێنەر نەیتوانی بەردەوام بێت بە هەر هۆیەك بێت.

(٧-٧) پێویستە لەسەر راهێنەر ژمارە سەرۆك تیپ (کاپتن) بە داوەر بلێت ئەگەر هاتوو سەرۆکی تیپ یاریگایی بەجێهێشت بە هەر هۆێك بێت.

(٧-٨) سەرۆکی تیپ دەتوانێت هەستێت بە ئیش و کاری راهێنەر ئەگەر راهێنەر نەیتوانی بەردەوام بێت ئەگەر یاریدەدەری راهێنەر ناوی نەبوو لە فۆرمی تۆمار (إستمارة التسجیل) وە یان نەیتوانی بەردوام بێت ئەگەر سەرۆکی تیپ هاتە دەرەوەی یاریگا بەهۆی هۆکارێکی رێگە پێدراوەوە دەتوانێت بە ردەوام بێت بە ئیش و کاری راهێنەر، ئەگەر هاتوو دوور خرایەوە بە هۆی هەڵەی نا وەرزشی ناتوانێت ئیش و کاری راهێنەر بکات جێگری سەرۆك تیپ دەتوانێت ئیش و کاری راهێنەر بکات.

(٧-٩) راهێنەر ئەتوانێت یاریزانی هەڵدانی سەربەست دەست نیشان بکات لە هەموو کاتەکانی کە یاسا هاوێژەری هەلدانی سەربەستی دیار نەکردوە.

## بەندی-٨- کاتی یاری، یەکسان بوون و کاتی زیادکراو:

(٨-١) یاری پێکدێت لە (٤) چارەك هەر چارەکێك (١٠) خولەکە.

(٨-٢) پشوو لەنێوان چارەکی (١-٢) وە (٣-٤) (٢)خولەکە وەپێش هەموو چارەکێکی زیادکراو پشوویەك هەیە.

(٨-٣) پشووی نیوەی کات بەینی چارەکی (٢-٣) (١٥) خولەکە نێوان گێمی یەکەم و گێمی دووەم.

(٨-٤) پشووی یاری دەستپێدەکات

١- بەر لە (٢٠) خولەك لە دەستپێکردنی یاری .

٢- کاتی دەنگی کاتژمێر دێت بۆ ئاماژە بە کۆتایی چارێکەکان .

## بەندی -٩- سەرەتا و کۆتایی چارەکەکان و یاری :

١. سەرەتای یاری دەست پێدەکات بە لێدانی تۆپ لە لایەن یەکێك لەو دوو یاریزانەی کە بەشداری دەکەن لەکرداری بەرز بوونەوەی تۆپ (کرة القفز) بەشێوەی یاسایی.

٢. سەرەتایی چارەکەکانی تر دەست پێدەکات بەهاتنە ناوەوەی تۆپ بەشێوەیەکی یاسایی دوای بەرکەوتنی تۆپ لە لایەن یاریزانانی ناو یاریگا دوای هەڵدانی لە لایەن یاریزانێك لە دەرەوە .

٣. یاری دەست پێ ناکات ئەگەر تیپ لە (٥) یاریزان کەمتر بوون لە سەرەتایی چارەکی یەکەم.

٤. لە هەموو یاریەکدا پێویستە ئەو تیپەی کە ناوی یەکەم هاتووە لەلای چەپی مێزی (داوەر)تۆمارکردن دابنیشێت ئاسایە ئەگەر شوێنەکەیان بگۆرن بە مەرجێ هەردوو تیپ رازیبن.

٥. لە سەرەتایی چارەکی یەکەم و سێیەم دەتوانن راهێنان بکەن لەسەر سەبەتەی بەرامبەر.

٦. سەبەتەکەیان دەگۆرن لە سەرەتایی گێمی دووەم واتا دوای ئەوەی چارەکی یەکەم و دووەم تەواو دەبێت.

٧. لە چارەکە زیاد کراوەکان لە هەمان سەبەتە یاری دەکەن کە لە چارەکی چوارەم یاریان کردووە.

٨. کۆتایی هەموو چارەکەکان و چارەکی زیاد کراو بە فیکەی داوەری کات گر کۆتایی پێ دێت.

٩. لە کۆتایی یاری ئەگەر خاڵەکان هەردوو تیپ یەکسان بوو یاری بۆ یەك گێمی زیاد کراو درێژ دەکرێتەوە .

١٠. کاتی گێمەکە بریتیە لە (٥) لە پێنج خولەك .

١١. ئەگەر بەم گێمە زیاد کراوە یاریەکە بە یەکسانی ماوە بەردەوام پێنج خولەك زیاد دەکرێت تا تیپێك سەرکەوتوو دەبێت لە کۆتایی.




وێنەی ژمارە (٥)

## بەندی -١٠- بارەکانی تۆپ ( حالات الكرة ) Status of the ball :

(١٠-١) تۆپ بە زیندو دادەنرێت کاتێك

١. تۆپ لێبدرێت بە شێوەیەکی یاسایی لەلایەن یەکێك لەو یاریزانەوە کە لەکاتی ئەنجام دانی تۆپی هەڵدراو( كرة القفز ).

٢. تۆپ زیندوە کاتێك داوەر تۆپ دەدات بەو یاریزانەی کە هەڵدانی سەربەست ئەنجام دەدات.

٣. کاتێك داوەر تۆپ دەدات بەو یاریزانەی کە دەیەوێت تۆپ لە دەرەوەی یاریگا بخاتە ناو یاریگا.

**(١٠-٢) تۆپ بە مردوو دادەنرێت کاتێك**

١. لەکاتی تۆمار کردنی خاڵ یان هەڵدانی سەربەستی سەرکەوتوو.

٢. لێدانی فیکە لەلایەن داوەرەوە کاتێك تۆپ زیندو بێت.

٣. کاتێك دیارە کە تۆپ ناچێتە ناو سەبەتەوە لە کاتی هەڵدانی سەربەست لە دوایەوە ئەمانە بێت

- هەڵدانێکی سەربەستی تر .
- سزایەکی تر هەبێت وەك (هەڵدانێك یان چەند هەڵدانێکی سەربەست یان هاتنە ناوەوەی تۆپ (حیازة).

٤. کاتێك داوەری کات گر فیکەی کۆتایی چارێگەکان لێدەدات.

٥. کاتێك داوەری (٢٤) چرکە. فیکەی (٢٤) چرکە لێدەدات.

٦. کاتێك یاریزانی هەر تیپێك دەستی بەر تۆپ بکەوێت تۆپ لە هەوا دابێت لە دوای دەرچوونی لە دەستی یاریزانی کە هاویشتنی بۆ گۆل. دوای

أ- هەر داوەرێك فیکە لێبدات.

ب-کاتێك داوەری کات گر فیکەی کۆتایی چارێگەکان لیّ دەدات.

ج- کاتێك داوەری (٢٤) چرکە فیکەی کۆتایی ماوەی هێرشەکە لیّ دەدات .

**بەندی -١١- شوێنی یاریزان و داوەر:**

ئەو شوێنە شوینی یاریزانە کە لیّ وەستاوە قاچەکانی لەسەر زەوی جێگیر کردوە. کاتیّ لە هەوا دەبێت لە کاتی باز (القفز) ئەو شوێنە دەبێتە جێگای لە کاتی دابەزینی بەر زەوی دەکەوێت. شوینی داوەریش بە هەمان شێوەی یاریزان دەبێت. کاتێك تۆپ بەر داوەر دەکەوێت.وا ئەژمێرێت بەر ئەم شوێنە کەوتووە. کە داوەر لیّ وەستاوە.

**بەندی -١٢- هەلدانی تۆپ ( کرة القفز ) و ئاڵو گۆری تۆپ لابوون ( الحیازة المتبادلة ):**

(١٢-١) هەلدانی تۆپ جیّ بەجیّ دەکرێت کاتیك داوەر تۆپ هەل دەدات لە نێوان دوو یاریزانی هەر دوو تیپی رکابەر لە ناو بازنەی ناوەند لە سەرەتایی چارێکی (الفترە)یەکەم.

(١٢-٢) الحیازة المتبادلة (تۆپ لەلابوونی بە نۆرە) Alternating possession

چاکترین رێگایە بۆ زیندو کردنەوەی تۆپ چارێکی تر بۆ دەست پیّ کردنەوەی یاری لە گەرانەوە بۆ هێمای(تۆپ لابوون بە نۆرە)لە جیاتی هەڵدانی تۆپ( کرة القفز).

(١٢-٣) ئەو تیپەی ماف تۆپ (لابوونی بە نۆرەی) هەیە پێویستە لە چارێکی دا هاتوو بە تۆپ هێنانە ناوەوە دەست بە یاری بکات لە ناوەندی گۆرەپان لە دەرەوەی سنوور کە بەرامبەر مێزی تۆمارکردنە .

(١٢-٤) تۆپ لابوونی بە نۆرە . دەست پێدەکات :-

❖ لەو ساتەی کە تۆپ لەبەر دەستی یاریزانە بۆ ئەنجامدانی تۆپ هێنانەوە ناوەوە .

(١٢-٥) كۆتایی دێت كاتێ:

- به‌ شێوه‌یه‌كی یاسایی له‌ لایه‌ن یاریزانێكه‌وه‌ له‌ناو یاریگه‌ تۆپ به‌رده‌كه‌وێت .
- ئه‌و تیپه‌ی ماف تۆپ هێنانه‌ ناوه‌وه‌ی هه‌یه‌ سه‌رپێچی له‌ یاسا ده‌كات .
- تۆپێكی زیندوو له‌سه‌ر هه‌لگره‌كانی سه‌به‌ته‌ گیر ده‌بێت له‌كاتی هێنانه‌ ناوه‌وه‌ .

(١٢-٦) ئاماژه‌ به‌و تیپه‌ده‌كرێت كه‌ تۆپ هێنانه‌ ناوه‌وه‌ی (لابوونی تۆپ به‌ نۆره‌ی ) ده‌درێتی. به‌ هۆی نیشانه‌ی تۆپ لابوونی به‌ نۆره‌( نیشانه‌كه‌ كه‌ راسته‌وخۆ رووه‌ و سه‌به‌ته‌ی به‌رامبه‌ره‌كانه‌) وه‌ ئه‌و نیشانه‌یه‌ راسته‌وخۆ پێچه‌وانه‌ ده‌كرێته‌وه‌ بۆ تیپی به‌رامبه‌ر كه‌ ماف تۆپ لابوونی به‌ نۆره‌ی هه‌یه‌ له‌ چارێكی داهاتوو .

## به‌ندی -١٣-چۆن یاری به‌ تۆپ ده‌كرێت:

### (١٣-١) پێناسه‌

له‌ كاتی یاری تۆپ به‌ ده‌ست یاری پێ ده‌كرێت وه‌یان، هاویشتن، پاسدان، پالنان، غلۆل كردن، له‌ زه‌وی دان، به‌پێ ی یاساكانی كه‌ له‌ یاسایی تۆپی سه‌به‌ته‌ هاتووه‌.

## به‌ندی -١٤-كۆنترۆل له‌ سه‌ر تۆپ. Control of the boll:

تیپ ده‌ست به‌سه‌ر داگرتنی (مسیطر) له‌ سه‌ر تۆپدا دا ده‌بێت هه‌ر كاتی یه‌كێك له‌ یاریزانه‌كانی تۆپ له‌ ژێر كۆنترۆلی دابێت له‌ شێوه‌ی گرتن یان ته‌پ ته‌پ بێت.

## به‌ندی-١٥- یاریزان له‌ باری هاویشتن بۆ سه‌به‌ته‌( اللاعب في وضع التصويب ):

هاویشتنی له‌ كاتی یاری یان هه‌لدانی سه‌ربه‌ست له‌ سه‌ر گۆل ئه‌و كاته‌یه‌ تۆپ له‌ ناو ده‌ستی یاریزان وه‌ ده‌هاوێژرێت بۆ ئاسمان به‌ ئاراسته‌ی سه‌به‌ته‌ی تیپی به‌رامبه‌ر به‌ مه‌به‌ستی خاڵ تۆمار كردن.

## به‌ندی -١٦- گۆل چۆن ده‌بێت وه‌ نرخه‌كه‌ی:

### (١٦-١) پێناسه‌

خاڵ ده‌ژمێردرێت كاتێك تۆپێكی زیندوو ده‌چێته‌ ناو سه‌به‌ته‌ له‌ سه‌ره‌وه‌ و له‌ ناوی تێپه‌ر ده‌بێت .

١. له‌ هه‌لدانی سه‌ربه‌ست به‌ (١) یه‌ك خال ده‌ژمێردرێت
٢. له‌ كاتی یاری له‌ ناو هێلی ناوه‌وه‌ی سێ خالّی به‌ (٢) خاڵ ده‌ژمێردرێت.
٣. له‌ كاتی یاری له‌ ده‌ره‌وه‌ی هێلی (٣) خالی به‌ (٣)سێ خاڵ ده‌ژمێردرێت.

## به‌ندی -١٧- تۆپ هێنانه‌ناوه‌وه‌ Throw-in:

هه‌ڵدانی ناوه‌وه‌ (رمية الإدخال) بریتیه‌ له‌ هاویشی تۆپ له‌لایه‌ن یاریزانێك له‌ ده‌ره‌وه‌ی یاریگا له‌ پشت هێلی ته‌نیشت یان هێلی كۆتایی بۆ یاریزانێكی ناو گۆره‌پان. دوای ئه‌وه‌ی داوه‌ر تۆپه‌كه‌ ده‌داته‌ یاریزانه‌كه‌ی ده‌ره‌وه‌ی یاریگا.

## بەندی -١٨- داواکردنی کاتی دابراو- charged time-out

**( ١٨-١ ) پێناسە**

بریتی یە لە وەستاندنی کاتی(راگرتن)ی یاری لەسەر داوای راهێنەری تیپ بۆ ماوەی یەك خولەك.

**( ١٨-٢ )** کاتی دابراو و دەست پێ دەکات و کۆتایی دێت

١. دەست پێ دەکات بە لێدانی فیکە لەلایەن داوەر و بە نیشاندانی هێمای کاتی دابراو.

٢. کۆتایی دێت بە لێدانی فیکە لەلایەن داوەر بەتەواو بوونی کاتی دابراو.

**( ١٨-٣ ) کات دەوەستێندرێت ئەگەر:**

١. کاتێك تۆپ مردوو بوو یان کاتی یاری وەستێندراو بوو دوای پەیوەندی داوەری یاریگا بە داوەری تۆمار کەر.

٢. تۆپ مردوو بوو دوای ئەوەی هەڵدانی سەربەستی کۆتایی بە سەرکەوتوویی ئەنجام درا.

٣. پێش ئەوەی تۆپ بدرێت بە یاریزانی هەڵدانی سەربەست.

٤. ئەگەر هەر رووداوێکی ناو یاریگا رووی داو تیپ داوای کاتی دابراوی کرد.

- کاتی دابڕاو کۆتایی پێ دێت ئەگەر تۆپ لەدەستی یاریزانی هەڵدانی سەربەست بوو.
- کاتی دابڕاو بۆ هەر تیپێك بریتییە لە:

١. لە چارەکی (١و٢) دوو کاتی دابڕاو هەیە.

٢. لە چارەکی (٣و٤) سێ کاتی دابڕاو هەیە.

٣. لە چارەکی زیاد کراو یەك کاتی دابڕاو هەیە بۆ هەر تیپێك.

- ناتواندرێت کاتە دابڕاوەکانی گێمی یەکەم بگوازرێتەوە بۆ گێمی دووەم یان بۆ چارەکە زیاد کراوەکان.
- ئەگەر راهێنەر داوای کاتی دابڕاوی کرد هیچ هەڵەیەك یان سەرپێچیەك نەکرا بوو ئەگەر خاڵ تۆمار کرا لەلایەن تیپی بەرامبەریەوە دەتوانیت کاتی دابراوی بدرێتێ.

## بەندی -١٩- گۆرینی یاریزان:

**( ١٩-١ ) پێناسە**

گۆرینی یاریزان بریتیە لەهەر وەستانێکی یاریەکە لەسەر داوای یاریزانی جێگرەوە.

**( ١٩-٢ )** هەلی گۆرین دەست پێ دەکات کاتێك

١. تیپ دەتوانێت گۆران بکات لە یاریزانێك یان زیاتر ئەگەر کاتی گۆرانی هەبوو.

٢. گۆرانکاری دەکرێت ئەگەر

- تۆپ مردوو بێت کات وەستاو بێت دوای کۆتایی پەیوەندی داوەر لەگەڵ داوەری تۆمارکەر.
- تۆپ مردوو بێت دوای تۆمارکردنی هەڵدانی سەربەستی کۆتایی بە سەرکەوتوویی بۆ هەردوو تیپ.

• دوای تۆمار كردنی خاڵ له (٢) خولەكی كۆتایی چارەكی (٤)وه یان هەر ماوەیەكی زیاد كراو بۆ بۆ ئەو تیپەی كه خاڵی لەسەر تۆماركراوه .

**( ١٩-٣ ) ناتواندرێت گۆران كاری بكرێت ئەگەر**

١. تیپ (٥) یاریزان كەمتر بوو له ناو یاریگا.

٢. ئەگەر ئەو یاریزانەی هەڵدانی سەربەستی هەبوو.

( ١٩-٤ ) تەنها یاریزان دەتوانێت داوایی گۆرین بكات دوای ئەوەی پەیوەندی كرد به داوەری تۆماركەرەوەر.

( ١٩-٥ ) دەتوانن گۆرانكاریەكه نەكەن به مەرجێ داوەر فیكەی لێنەدابوو بۆ گۆرینی یاریزانەكە.

( ١٩-٦ ) كاتێك داوەر فیكەی لێداو داوەر هێمایی گۆرانكاری بەرز كردەوەئەبێت یاریزان چاوەرێ بكات تا داوەر رێگەی دەدات بچێته ناو یاریگا.

( ١٩-٧ ) ئەگەر گۆران كاری هەبوو یان هەڵەی (٥)ی تۆمار كرد دەبێت یاریزان به خێرایی ئەنجامی بدات ئەگەر وەستا تا (٣٠)چركه خۆیی دواخست داوەر دەتوانێت فیكەی كاتی دابراو لێبدات چونكه بەشێوەی ئەنقەست خۆی دواخستوه ئەگەر تیپ كاتی دابراوی نەمابوو ئەوا هەڵەی هونەری لێدەدرێت لەسەر راهێنەر(B2) سزا دەدرێت.

( ١٩-٨ ) دەتواندرێت گۆران كاری بكرێت:

- دوای دواین هەڵدانی سەربەست بەشێوەیەكی سەركەوتوو.
- ئەژمار كردنی هەڵه له نێوان هەڵدانه سەربەسته كانەوه.
- ئەژمار كردنی هەڵه له نێوان هەڵدانه سەربەستەكانەوه دوای هەڵدانه سەربەستەكەو پێش جێبەجێ كردنی هەڵه تازەكە.
- ئەگەر هەڵەیەك تۆماركرا پێش ئەوەی كه تۆپ زیندوو بێت دوای ئەنجام دانی هەڵدانی سەربەستی كۆتایی دەتوانێت گۆرانكاری بكەیت پێش ئەوەی تۆپ یاری بكرێت
- ئەگەر سەر پێچیەك بكرێت پێش ئەوەی تۆپ زیندوو بێت دەتوانێت گۆران بكەیت.



وێنەی ژمارە ( ٦ )

**بەندی -٢٠- دۆراندنی یاری یان کشاندوەی: ( خسارة المباراة بالانسحاب ) me lost by for fit**

تیپ بە دۆراو دادەنرێت یان بە کشانەوە دەدۆڕێنێ .

١. ئەگەر تیپێك ئامادەی نەبوو یان (٥) یاریزانی ئامادە نەبوو لە سەرەتای یاریی تا (١٥) خولەك دوای کاتی دیاری کراوی یاری.
٢. ئەنجام دانی هەندێ رەفتار کە هۆکار بێت بۆ بەردەوام نەبوونی یاری.
٣. لە کاتی دەست پێکردنی یاری یان هەر کاتێك ئامادە نەبوون بێنە ناو یاریگاوە بۆ یاریکردن.

**( ٢٠-١ )** سزا :

یارییەکە بۆ رکابەرەکەی دەبێت وە ئەنجامەکەش ( ٢٤ ) دەبێت . سەرەرای ئەوەی تیپی کشاوە هیچ خاڵ وەرناگرێت .

**بەندی -٢١- دۆرانی تیپ بە نە توانایی : ( خسارة المباراة بالإخفاق ) me lost by default**

کاتێك تیپ بە دۆراو دادەنرێت ئەگەر یاریزانانی ناو یاریگا لە دوو کەس کەمتر بوون لە کاتی یاریدا.

**( ٢١-١ )** سزاکەی :

ئەگەر هاتوو ئەو تیپەی بە براوە دادەنرێت بە خاڵ لە پێش بوو ئەوا ئەنجامەکەی بەو شێوەیە دەبێت کە کاتەکەی تیا وەستاوە بەڵام ئەگەر لە دواوە بوو ئەوا بە (٢-٠) ئەنجامەکە دادەنرێت تیپی دۆڕاو یەك خاڵ وەردەگرێت لە ریز بەندی خولەکە.

**بەندی-٢٢- سەرپێچی : ( المخالفات )**

شکاندنی یاساکانی یاری

سزاکەی:

تۆپەکە دەدرێت بە تیپی بەرامبەر لە نزیکترین خاڵی سەر پێچی دەگەرێندرێتەوە بۆ ناو یاریگا.

**بەندی -٢٣- یاریزان لە دەرەوەی سنور تۆپ لە دەرەوەی سنور :**

**( ٢٣-١ ) پێناسە Definition**

ئەگەر یاریزان بەشێك لە لەشی یان هەموو لەشی چووە سەر هێڵی تەنیشتەکان کاتێك تۆپی پێ بوو بە سەرپێچی دادەنرێت.

**( ٢٣-٢ ) چوونە دەرەوەی تۆپ :**

کاتێك تۆپ بەر هێڵی تەنیشتەکان یان کۆتایی دەکەوێت یان لە دەرەوەی یاریگا بەر زەوی یان هەر شتێك بکەوێت دەبێتە سەرپێچی.

**بەندی -٢٤- تەپ تە پە : ( المحاورة )**

**پێناسە :**

یاریزان ماف خۆیەتی بەشێوەیەکی یاسایی تەپ تەپە بکات لە ناو یاریگادا.

یاریزان دەتوانێت تەپ تەپە بکات ئەگەرتەپ تەپەی نەکردبوو.

١. ئەگەر تەپ تەپەی کرد پاشان تۆپی گرت بۆی نیە تەپ تەپە بکاتەوە.

٢. یاریزان ناتوانێت بە هەردوو دەست تەپ تەپە بکات.

**سزاکەی**

ئەگەر هاتوو ئەم سەرپێچیانەی کرد دەبێتە هۆی لە دەست دانی تۆپ و دەچێتە دەستی تیپی بەرامبەر.

(٢٤-١) ئەم بارانەی خوارەوە بە تەپ تەپ کردن دادنرێت

١. تێگرتنی لە دوای یەك لە پێناو گۆڵێکی مەیدانی .

٢. تۆپ لە دەست کەوتن لەسەرەتا و کۆتایی تەپە پەپ کردندا .

٣. هەوڵەکانی کۆنترۆل کردنی تۆپ ، بە لابردنی لە بواری یاریزانەکانی تردا .

٤. لە تۆپدان کاتێ تۆپەکە لە کۆنترۆلی یاریزانێکی تردایە.

## بەندی -٢٥- رۆیشتن بە تۆپ : الجري

(٢٥-١) یاریزان دەتوانێت بروات بە تۆپەوە بە شێوەیەکی یاسایی.

(٢٥-٢) یاریزان دەتوانێت بروات پاش تەپە کردن. (واتە دەتوانێت بە تەپ تەپە بروات)ئەگەر یاریزان پێیەکی جوولاند وە پێیەکی چەسپاو بوو ئەوە بۆی نیە پێیە چەسپاوەکەی بجوولێنێت وە ئەگەر هاتوو جوولاندی دەبێتە هەڵەی رۆیشتن بە تۆپەوە (هۆك).

(٢٥-٣) ئەگەر هاتوو یاریزان سێ بازی کرد بەڵام لە هەنگاوی سێ یەمدا تۆپ لە دەستیا مایەوە ئەوە دەبێتە هەڵەی رۆیشتن بە تۆپەوە (هۆك).

(٢٥-٤) ئەگەر یاریزان کەوت لە یاریگادا وە تۆپی پێ بوو نابێت هەڵسێتەوە بە پێچەوانەوە دەبێتە هەڵەی رۆیشتن.

## بەندی -٢٦- (٣) سێ چرکە : ثلاث ثوان

ئەم سەرپێچی یە روو دەدات ئەگەر یاریزان لە سێ چرکە زیاتر لە ناوچەی قەدەغە کراوەی تیپی بەرامبەر مایەوە لەو کاتەی کە تۆپ لە ژێر دەستی ( کۆنترۆلی ) تیپەکە دابێت .وە کاتژمێریش لە سورانەوە بێت .

(٢٦-١) پێویستە رێگە بەو یاریزانە بدرێت کە

١. لە هەوڵدایە بۆ جێهێشتنی ناوچەی قەدەغەکراوە .

٢. خۆی یان یەکێك لە برادەرەکانی لە باری تێگرتندایە و تۆپ لە باری دەرچوونە یان تازە دەستی یاریزانی جێهشتووە بۆ تێگرتنێکی مەیدانی .

## بەندی -٢٧- (٨) هەشت چرکە : ثمان ثوان

پێویستە لەسەر یاریزانان لە ماوەی کەمتر لە هەشت چرکە تۆپ لە یاریگای خۆیانەوە بگوازینەوە یاریگای تیپی بەرامبەر.

( ٢٧-١ ) تۆپ لە ناوچەی پێشەوە تیپە کاتێ:

١. تۆپ بەر ناوچەی پێشەوە دەکەوێت .

٢. تۆپ بەر یاریزانێك یان ناوبژیوانێك دەکەوێ کە بەشێك لەلەشی بەر ناوچەی پێشەوە دەکەوێ.

٣. تۆپ دەچێتە ناوچەی پێشەوەی تیپ کاتێ . لە میانی تەپ تەپە لە ناوچەی دواوە بۆ ناوچەی پێشەوە . هەردوو پێی تەپ تەپەکار و تۆپ بەر ناوچەی پێشەوە دەکەون .

( ٢٧-٢ ) ژماردنی (٨) چرکە بەردەوام دەبێت لە کاتی وەستانەوە کاتێ هەمان ئەو تیپەی کۆنترۆلی تۆپی کردووە تۆپ هێنانە ناوەوەی دەدرێتی لە ناوچەی دواوە لە میانی ئەو (٨) چرکەیەدا وەك ئەنجامێکی :-

١. دەرچوونی تۆپ بۆ دەرەوەی سنورەکان .

٢. پێکانی یاریزانێکی ئەو تیپەی کۆنترۆلی تۆپی کردووە .

٣. یاری تۆپ هەڵدان .

٤. هەڵەی دووانی (المزدوج)

٥. لابردنی سزا یەکسانەکانی سەر هەردوو تیپ .

## بەندی -٢٨- ( ٢٤ ) بیست و چوار چرکە : اربع و عشرون ثانية

دەبێت یاریزانانی تیپ لە ماوەی (٢٤) چرکەدا تۆپ هەڵدەن بۆ سەبەتەی تیپی بەرامبەر.

**لەم کاتانەدا (٢٤)چرکە تازە دەبێتەوە**

١. ئەگەر تۆپ بدات بە بازنە ئاسنەکە ( الحلقة ) - Ring.

٢. ئەگەر یاریزانی تیپی بەرامبەر بە شێوەیەکی ئەنقەست قاچ بەرێت بۆ تۆپ بەری بکەوێت.

٣. لە دوای هەموو هەڵەیەك کە تۆمار دەکرێت.

٤. ئەگەر یاری وەستێنرا لەلایەن داوەرەوە لە بەرژوەندی تیپی بەرامبەر لە کاتی نائاسایی.

٥. ئەگەر تۆپ هاوبەش بوو پێش ئەوەی تۆپ هاوبەش بێت لای تیپی بەرامبەر بێت پاش فیکەی داوەر تۆپ بێتە لای ئەو تیپە.



وێنەی ژمارە ( ٧ )

### بەندی -٢٩- یاریزانی گەمارۆ دراو : اللاعب المطبق عليه

**پێناسە:**

ئەگەر یاریزان کۆنترۆڵی تۆپی کرد بەرگری کار هات بۆلای پێویستە تەپە بکات یان پاس بدات یان هەڵدات بەرەو سەبەتە ئەگەر ئەمانە نەکات پێویستە (٥) چرکە زیاتر تۆپی لا نەمێنێتەوە.

### بەندی -٣٠- گەڕاندنەوەی تۆپ بۆ یاریگایی دواوە: عودة الكرة الى الساحة الخلفية

کاتێك تۆپ و یاریزان بە تەواوەتی دەچێتە ناو یاریگای بەرامبەر ئەگەر هاتوو ئەو یاریزانەی تۆپی لەلایە بگەڕێتەوە بۆ یاریگای دواوە یان بەر هێڵی ناوەڕاست بکەوێت دەبێت بە سەرپێچی گەڕانەوەی تۆپ.

### بەندی -٣١- کار کردنە سەر سەبەتە یان ڕێگە گرتن لەتۆپ: التاثير على الهدف

ئەگەر هاتوو تۆپ هەڵدرا بۆ سەبەتە کاتێك دێتە خوارەوە یان لەو کاتەدا کار بکەنە سەر سەبەتە لە لایەن بەرگریکارەوە ئەوا بە سەرپێچی دادەنرێت و خاڵەکە تۆمار دەکرێت یان ڕێگری بکەن لە چوونە ناوەوەی تۆپ بۆ ناو سەبەتە.

(٣١-١) هەڵدان بۆ سەبەتە بۆ خاڵ تۆمار کردن

- دەستپێدەکات کاتێ تۆپێکی زیندوو دەستی (دەستەکان) یاریزان جێ دێڵێ کە لە باری هەڵدانە .
- کۆتایی دێت کاتێ تۆپ :-
  1. دیار کەوت کە ئەگەری نیە بچێتە ناو سەبەتەکە .
  2. بەر ئەلقەکە دەکەوێت .
  3. بەر زەوی دەکەوێت .
  4. دەبێتە مردوو.

(٣١-٢) کارکردنە سەر گۆل ڕوودەدات لە کاتی هەڵدان بۆ سەبەتە کاتێ یاریزان بەر تۆپ دەکەوی. کە بە تەواوی لەسەر ئاستی ئەلقەکەیەوە وە:-

1. لە باری دابەزینە بۆ ناو سەبەتە .
2. دوای ئەوەی بەر تابلۆ دەکەوێ .

(٣١-٣) ئەگەر لە یاسا لادان لە لایەن بەرگری ئەنجام درا تیپی هێرشبەر :-

1. (١) یەك خالی دەدرێتی ئەگەر تۆپەکە لەباری هەلدانی سەربەست بوو ( رمیه الحره ).
2. (٢) دوو خالی دەدرێتی ئەگەر تۆپەکە لە ناوچەی هەڵدانی مەیدانی (٢) خاڵی بوو .
3. (٣) سێ خالی دەدرێتی ئەگەر تۆپەکە لە ناوچەی هەڵدانی مەیدانی (٣) خاڵی بوو .

### بەندی -٣٢- هەڵەکان: الأخطاء: Fouls

شکاندنی یاسا و بەرکەوتنی تاکە کەسە لەگەڵ بەرامبەرەکەی یان کردنی ڕەوشتی نا یاساییە دوور لە گیانی وەرزشی.

**سزاكەی:**

دانی تۆپە بە تیمی بەرامبەر و تۆمار كردنی هەڵەكەیە لەسەر یاریزان و تیپ.

یاریزان دەتوانێت بەشێوەیەكی یاسایی بەرگری بكات لە سەبەتەو تۆپ لە ناو یاریگا .

## بەندی -٣٣- هەڵەی تاكە كەسیی : الخطأ الشخصي : Personal Fouls

بەرگری كردنە بەشێوەیەكی نایاسایی وە دەكرێت بە چەند بەشێكەوە

١. راكێشان
٢. گرتن
٣. پاڵنان (دفع)
٤. رێگە گرتن واتا(ألأعاقه)

سزایی هەڵەی كەسیی (الخطأ الشخصي)

١. نوسینی هەڵەكە لەسەر یاریزانەكە. (p)
٢. ئەگەر دوو خاڵیشی تۆماركرد یەك هەڵدانی سەربەستی دەدرێتێ. (p1) دەنوسرێت .
٣. ئەگەر لە سێباز بوو یان لە هەڵدانی دوانیدا بوو بۆ سەبەتە خاڵی تۆمار نەكردئەوا دوو هەڵدانی سەربەستی دەدرێتێ. (p2)لەسەر یاریزان دەنوسرێت.
٤. ئەگەر لە هەڵدانی تۆماركردنی سێ خاڵیدا بوو بۆ سەبەتە ئەگەر سێ خاڵەكەی تۆماركرد یەك هەڵدانی سەربەستی دەدرێتێ (p1) بەلآم ئەگەر تۆماری نەكرد سێ هەڵدانی سەربەستی دەدرێتێ (p3)لەسەر یاریزلن دەنوسرێت .



وێنەی ژمارە(٨)

## بەندی -٣٤- هەڵەی دووانی : الخطأ المزدوج : Double Foul

کردنی دوو هەڵەیە لەلایەن دوو یاریزانی هەر دوو تیپ لە یەك کاتدا دژی یەکتری .

سزاکەی / تۆمارکردنی هەڵەی کەسی لەسەر هەردوو یاریزان . بەبێ دانی هەڵدانی سەربەست ( الرمیة الحرة).

١. ئەگەر تۆپ لای تیپی (أ) بوو دەچێتەوە لای هەمان تیپ.
٢. ئەگەر تۆپ لای تیپی (ب) بوو دەچێتەوە لای هەمان تیپ.
٣. ئەگەر لە هەوادا بوو دەچینەوە سەر هێمایی( تۆپ لەلابوون بە نۆرە) بزانین تۆپ دەچێتە لایی کامیان

## بەندی -٣٥- هەڵەی بەدرەوشت : خطأ سوء السلوك

ئەگەر یاریزانێك هەڵەیەکی بە ئەنقەست ئەنجام بدات یا خوود یاریزان بەرەو سەبەتەی تیپی بەرامبەر بروات هیچ یاریزانێك نەبێت لە نێوان ئەو یاریزانەو سەبەتەکەدا کار بکەیتە سەری یان هەڵە ئەنجام بدات.

سزاکەی:

١. پێدانی دوو هەڵدانی سەربەست و تۆپ دان پێیان دوای هەڵدانەکە. (U2)دەنوسرێت لە فۆرمی یاری.
٢. ئەگەر خاڵیشی تۆمار کردبوو یەك هەڵدان سەربەست و لەگەڵ دانی تۆپ پێیان دوای هەڵدانەکە. (U1) دەنوسرێت .
٣. ئەگەر لە هەڵدانی سیانیدا بوو ئەوا سێ هەڵدانی سەربەست و دانی تۆپ پێیان دوای هەڵدانەکە. (U3) دەنوسرێت لە فۆرمی تۆماری یاری لە بەرامبەر ناوی یاریزانەکە .
٤. ئەگەر یاریزان دوو هەڵەی بەئەنقەست ئەنجامبدات یەکسەر دەکرێتە دەرەوە دەبێتە هەڵەی نەشیاو .

## بەندی -٣٦- هەڵەی نەشیاو : خطأ عدم الاهلية

ئەو هەڵەیە کە (یاریزان، راهێنەر ،یاریدەدەری راهێنەر، هەریەکە لە ئەندامانی تیپ)
بە شێوەیەکی ناوەرزشی ئەنجامی دەدات وەك: (شەرکردن، تف کردن، قسەی ناشرین.......)

سزاکەی:

١. دوورخستنەوەی لە یاریگا نابێت لە شوێنی یەدەگە کانیش دابنیشێت.
٢. دوو هەڵدانی سەربەست . لەگەڵ پێدانی تۆپ دوای هەڵدانەکە بەتیپی بەرامبەر.
٣. وە لە فۆرمی تۆمار بە .D2 دەنووسرێت.

## بەندی -٣٧- هەڵەی هونەری : خطأ الفني : Technical foul (T2)

ئەم جۆرە هەڵەیە بە شێوەی قسە دەکرێت وەك (رەخنە گرتن لە داوەر)، واتا بەرکەوتنی تێدا نیەلەگەڵ یاریزانی تیپی بەرامبەر .

سزاکەی:

دوو هەڵدانی سەربەست و لەگەڵ دانەوەی تۆپ بە تیپی بەرامبەر بۆ دەست پێ کردنەوەی یاری لە ناوەراستی گۆرەپان

( ٣٧-١ ) ئەگەر هەڵەی هونەری ئەنجام درا:

١. ئەگەر هاتوو یاریزان لەناو یاریگا ئەنجامی بدات ئەوا لەسەر یاریزان تۆمار دەکرێت بە (T2) دەنوسرێت.
٢. ئەگەر (یاریدەدەری ڕاهێنەر، یاریزانی یەدەك،پشتیوانانی تیپ) ئەنجامی بدات لەسەر ڕاهێنەر تۆمار دەکرێت بە (B) دەنوسرێت.
٣. هەڵەی هونەری لەسەر ڕاهێنەر بە (C2) دەنوسرێت.
٤. ئەگەر دوو هەڵەی هونەری تۆمارکرا لەسەر ڕاهێنەر یەکسەر دوور دەخرێتەوە.
٥. ئەگەر سێ هەڵەی هونەری تۆمارکرا لەسەر یاریدەدەری ڕاهێنەر یەکسەر دوور دەخرێتەوە.

## بەندی -٣٨- پێنج هەڵەی یاریزان: خمسة أخطاء على اللاعب

ئەگەر هاتوو یاریزانێك پێنج هەڵەی تۆمار کرد لە یاریدا ئەوا دەکرێتە دەرەوەو یاریزانێکی تر دێتە شوێنی.

( ٣٨-١ ) هەڵە لەسەر یاریزانێك کە تازە هەڵەی پێنجەمی ئەنجام داوە . بە هەڵەی (جیا) دادەنرێت و لەسەر ڕاهێنەر دەژمێردرێت وە لە ئەنکێتی تۆمارکردندا (B) دەنوسرێت .

## بەندی -٣٩- هەڵەی تیپ: اخطاء الفريق

١. ئەگەر هاتوو لە یەك چارەکدا چوار هەڵە ئەنجام درا ئەوا لەدوای هەڵەی چوارەم دەبێتە دوو هەڵدانی سەربەست.
٢. ئەم چوار هەڵەیە تەنها بۆ یەك چارێکە واتا چارێکی دوای ئەو تازە دەبێتەوەنامێنێ.

( ٣٩-١ ) گشت هەڵەکانی تیپ کە لە هەر پششویەکی یاری ئەنجام درا بن . دەکرێ وەك بەشێك لە ماوە یان ماوەی زیاد کراو دابنرێن .

( ٣٩-٢ ) گشت هەلەکانی تیپ کە لە هەر ماوەیەکی زیاد کراو ئەنجام دەدرێن وە بەشێك لە ماوەی چوارەم دادنرێت .

## بەندی -٤٠- داوەر: الحكام

یاری تۆپی باسکە پێویستی بە (٣)سێ داوەری گۆرەپان هەیە. وە(٤) چوار داوەی مێز هەیە کە بریتین لە (کات گر، تۆمار کەر، کات گری ٢٤چرکە، یاریدەدەری تۆمار کەر)



وێنەی ژمارە ( ٩ )

### جل و بەرگی ناوبژیوان:

١. کالەی ڕەش
٢. پانتۆڵی ڕەش
٣. فانیلەی ڕەش و ڕەساسی
٤. قایشی ڕەش
٥. فیکە.

## بەندی -٤١- داوەری یەکەم – ئەرك و دەسەڵات :

١. پێویستە ئەو ئامێرو پێویستیانەی کە بۆ یاری بەکاردێت بیپشکنێت .
٢. دانانی کات ژمێری یاری و کات ژمێری (٢٤) چرکە وە دڵنیا بوون لە کارکردنیان .
٣. هەڵبژاردنی تۆپی یاری .
٤. نەهێڵێت یاریزان ئەو پێداویستیانە بەکاربهێنێت کە دەبێتە هۆی برینداربوونی یاریزانان .
٥. هەڵدانی تۆپ لە نێوان هەردوو تیپ سەرەتای چارێکی یەکەم بۆ دەست پێکردنی یاری .
٦. وەستانی یاری لە کاتی پێویست .
٧. دەستەڵاتی هەیە تیپ بە کشانەوە لە یارییەکە دابنێ .
٨. تەماشاکردنی فۆرمی تۆمار لە کۆتایی یاری و هەر کاتێکی پێویست بێت .
٩. داوەر هەڵدەستێت بە واژووکردنی فۆرمی تۆمار دوایی تەواو بوونی یاری وە داوەر لە (٢٠) خولەك پێش دەست پێکردنی یاری دەستەڵاتی هەیە بریار بدات .
١٠. ئەگەر کشانەوە روویدا یان رەفتاری ناشرین رویدا لە لایەن ( راهێنەر ، یاریدەدەری راهێنەر ، یاریزانانی یەدەك ، هەریەك لە ئەندامانی تیپ ) بە (٢٠) خولەك پێش دەست پێکردنی یاری یان لە نێوان چارێکەکان پێویستە لەسەر داوەری یەکەم پێش واژوو کردنی لە پشتی فۆرمی تۆمار راستی روداوەکان بنووسێت وە داوەری یەکەم یان سەرپەرشتیاری هونەری راپۆرتێك بنووسن لەسەر یاریەکە.
١١. دەتوانێت بریاری کۆتایی بدات لە هەبوونی بریاری جیاواز پاش گفت و گۆ لەگەڵ داوەری (٢–٣) وە سەرپەرشتیاری هونەری و داوەری سەر مێز .
١٢. ئەگەر فیکەی کۆتایی یاری لێدرا لە لایەن داوەری کات گر دڵنیا نەبوو لەو خاڵەی تۆمارکراوە لە کاتی تەواو بوونی یاریەکەدا دەتوانێت لەگەڵ داوەری کات گر و سەرپەرشتیاری هونەری بدوێت و پاشان بریار بدات .
١٣. دەتوانێت بریار بدات لەسەر هەر بریارێك کە لە یاسادا روون نەکرابێتەوە و روونی بکاتەوە .

## بەندی -٤٢- داوەری سەر مێز :

بریتی یە لە تۆمارکەر / یاریدەدەری تۆمارکەر / کات گر / کات گر (٢٤) چرکە .

## بەندی -٤٣- تۆمارکەر / یاریدەدەری تۆمارکەر / ئەرکەکانیان :

١. بەکارهێنانی فۆرمی تۆماری یاسایی.
٢. نووسینی ناوی یاریزانان و ئەندامانی تیپ .
٣. دەست نیشان کردنی (٥) یاریزانانی سەرەکی لە سەرەتای یاری .

٤. نوسینی هەڵەکان لەسەر ( ڕاهێنەر ، یاریدەدەری ڕاهێنەر ، یاریزانان)

٥. ئاگادارکردنەوەی داوەر لە (٥) هەڵەی یاریزان و چوار هەڵەی تیپ .

٦. دەست نیشان کردنی ئاراستەی تۆپ لە سەرەتای چارێگەکان و لە ڕێگەی جولاندنی نیشانەی تۆپ لە لا بوون بە نۆرە .

٧. کۆکردنەوەی خاڵەکانی هەردوو تیپ .

٨. پڕکردنەوەی زانیاریەکان لەسەر فۆرمی تۆمار بە ڕاستی بێ هەڵە .

٩. کاتە دابراوە دەنووسێ . وە لە کاتی وەرگرتنی کات ئاگاداری داوەر دەکاتەوە .

## بەندی -٤٤- کات گر :

### ( ٤٤-١ ) کات گر - ئەرکەکانی :

١. هەڵدەستێت بە هەژمارکردنی کاتی یاری ، کاتی دابراو ، کاتی پشوو.

٢. لە کۆتایی هەموو چارەکەکان فیکەی کۆتایی لێدەدات .

٣. ئاگادارکردنەوەی یاریزان و داوەر پێش (٣) خولەك لە سەرەتایی چارەکی یەکەم و سێیەم .

٤. لە بوونی هەر هەڵەیەك داوەرانی ناو یاریگا ئاگادار دەکاتەوە.

### ( ٤٤-٢ ) کاتی یاری دەست پێ دەکات :

١. بە لێدانی تۆپ بە شێوەیەکی یاسایی لە لایەن هەریەکە لەو دوو یاریزانەی کە هەڵدەستن بە لێدانی تۆپی بەرزکراوە ( كرة القفز).

٢. دوای هەڵدانی سەربەستی سەر نەکەوتوو پاش ئەوەی کە تۆپ بەر یاریزان دەکەوێت لەناو یاریگا .

٣. پاش ئەوەی کە یاریزان تۆپ لە دەرەوەی یاریگا لە سنوورەکانەوە دەخاتە ناو یاریگا بەر دەستی یاریزان دەکەوێت .

### ( ٤٤-٣ ) کات دەوەستێنێت :

١. دوای تەواو بوونی کاتی چارەکەکان (الفترات) .

٢. دوای لێدانی فیکە لەلایەن داوەرەوە کاتێك تۆپ زیندوو بێت .

٣. دوایی ڕودانی هەر پێکانێکی ناو یاریگا یان داواکردنی کاتی دابراو .

٤. لە دوو خولەکی کۆتایی چارەکی چوارەم و چارەکی زیاد کراوەکان پاش تۆمارکردنی خاڵ.

٥. پاش لێدانی فیکە لە لایەن کات گری ( ٢٤) چرکەوە .

### بەندی -٤٥- کات گر (٢٤) چرکە – ئەرکەکانی :

دەست پێکردنی (٢٤) چرکە :

کاتێك کە تۆپ بەر دەستی یاریزان دەکەوێت بە شێوەیەکی یاسایی .

**(٤٥-١) تازەکردنەوە و وەستاندنی (٢٤) چرکە :**

١. کاتێك داوەر فیکەی سەرپێچی یان هەڵە لێدەدات .

٢. کاتێك تۆپ دەچێتە ناو سەبەتەوە .

٣. کاتێك تۆپ بەر رینگ دەکەوێت .

٤. کاتێك یاری دەوەستێندرێت بەهۆی روداوێك(فعل) لە بەرژەوەندی ئەو تیپەی کە تۆپی لا نەبێت .

**(٤٥-٢) -(٢٤) چرکە تازە نابێتەوە کاتی کە هەمان تیپ کۆنترۆلی لەسەر تۆپ هەبوو، تۆپ هێنانە ناوەوەی پێ دەدرێت لە ئەنجامی :**

١. چونە دەرەوەی تۆپ .

٢. پێکانی یاریزانی هەمان تیپ کە تۆپی لە کۆنترۆل دایە .

٣. باری تۆپ هەڵدان ( كرة القفز)

٤. هەڵەی دووانی (خطأ المزدوج).

٥. رەت کردنەوەی هەموو سزاکانی سەر هەردوو تیپ .(جزاءت متساوية ).



وێنەی ژمارە (١٠)

## هێمای خاڵی تۆمار کراو










نیشانەکانی داوەر ( إشارات الحكم )




هێمای سەرپێچی ( المخالفة )

41
گرتن

40
بیاکێشان

39
ڕێگرتن(عرقلة)

38
بیاکێشان

45
هەڵەی دوانی
(المزدوج)

44
هەڵەی هێرشی

43
هەڵەی هێرشی لەسەر
نەویاریزانەی تۆپی
پێیە (داش)

42
پاڵنان

48
هەڵەی نەشیاو
(عدم الاهلي)

47
هەڵەی بەنەنقەست
(المتعمد)

46
هەڵەی هونەری
(الفني)

هێمای هەڵەکان (الاخطا)

## هێمای ژمارەی هەڵدانە سەربەستەکان




## هێمایی ئاراستەی یاری




## هێمای کاتێك داوەر تۆپ دەدات بە یاریزانی هەڵدانی سەربەست




## هێمای وەستانی داوەری دەرەوەی هێڵی هەڵدانی سەربەست




FEDERATION INTERNATIONALE DE BASKETBALL
INTERNATIONAL BASKETBALL FEDERATION
**SCORESHEET**

فۆرمی تۆماری یاری

Team A ______________________ Team B ______________________

Competition ________ Date ________ Time ________ Referee ______________________
Game No. ________ Place ______________ Umpire 1 ____________ Umpire 2 ____________

Team A ______________________
Time-outs
Team fouls
Period ① 1 2 3 4 ② 1 2 3 4
Period ③ 1 2 3 4 ④ 1 2 3 4
Extra periods

| Licence No. | Players | No. | Player in | Fouls 1 | 2 | 3 | 4 | 5 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | 4 | | | | | | |
| | | 5 | | | | | | |
| | | 6 | | | | | | |
| | | 7 | | | | | | |
| | | 8 | | | | | | |
| | | 9 | | | | | | |
| | | 10 | | | | | | |
| | | 11 | | | | | | |
| | | 12 | | | | | | |
| | | 13 | | | | | | |
| | | 14 | | | | | | |
| | | 15 | | | | | | |
| Coach | | | | | | | | |
| Assistant Coach | | | | | | | | |

Team B ______________________
Time-outs
Team fouls
Period ① 1 2 3 4 ② 1 2 3 4
Period ③ 1 2 3 4 ④ 1 2 3 4
Extra periods

| Licence No. | Players | No. | Player in | Fouls 1 | 2 | 3 | 4 | 5 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | 4 | | | | | | |
| | | 5 | | | | | | |
| | | 6 | | | | | | |
| | | 7 | | | | | | |
| | | 8 | | | | | | |
| | | 9 | | | | | | |
| | | 10 | | | | | | |
| | | 11 | | | | | | |
| | | 12 | | | | | | |
| | | 13 | | | | | | |
| | | 14 | | | | | | |
| | | 15 | | | | | | |
| Coach | | | | | | | | |
| Assistant Coach | | | | | | | | |

RUNNING SCORE

| A | B | A | B | A | B | A | B |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 1 | 41 | 41 | 81 | 81 | 121 | 121 |
| 2 | 2 | 42 | 42 | 82 | 82 | 122 | 122 |
| 3 | 3 | 43 | 43 | 83 | 83 | 123 | 123 |
| 4 | 4 | 44 | 44 | 84 | 84 | 124 | 124 |
| 5 | 5 | 45 | 45 | 85 | 85 | 125 | 125 |
| 6 | 6 | 46 | 46 | 86 | 86 | 126 | 126 |
| 7 | 7 | 47 | 47 | 87 | 87 | 127 | 127 |
| 8 | 8 | 48 | 48 | 88 | 88 | 128 | 128 |
| 9 | 9 | 49 | 49 | 89 | 89 | 129 | 129 |
| 10 | 10 | 50 | 50 | 90 | 90 | 130 | 130 |
| 11 | 11 | 51 | 51 | 91 | 91 | 131 | 131 |
| 12 | 12 | 52 | 52 | 92 | 92 | 132 | 132 |
| 13 | 13 | 53 | 53 | 93 | 93 | 133 | 133 |
| 14 | 14 | 54 | 54 | 94 | 94 | 134 | 134 |
| 15 | 15 | 55 | 55 | 95 | 95 | 135 | 135 |
| 16 | 16 | 56 | 56 | 96 | 96 | 136 | 136 |
| 17 | 17 | 57 | 57 | 97 | 97 | 137 | 137 |
| 18 | 18 | 58 | 58 | 98 | 98 | 138 | 138 |
| 19 | 19 | 59 | 59 | 99 | 99 | 139 | 139 |
| 20 | 20 | 60 | 60 | 100 | 100 | 140 | 140 |
| 21 | 21 | 61 | 61 | 101 | 101 | 141 | 141 |
| 22 | 22 | 62 | 62 | 102 | 102 | 142 | 142 |
| 23 | 23 | 63 | 63 | 103 | 103 | 143 | 143 |
| 24 | 24 | 64 | 64 | 104 | 104 | 144 | 144 |
| 25 | 25 | 65 | 65 | 105 | 105 | 145 | 145 |
| 26 | 26 | 66 | 66 | 106 | 106 | 146 | 146 |
| 27 | 27 | 67 | 67 | 107 | 107 | 147 | 147 |
| 28 | 28 | 68 | 68 | 108 | 108 | 148 | 148 |
| 29 | 29 | 69 | 69 | 109 | 109 | 149 | 149 |
| 30 | 30 | 70 | 70 | 110 | 110 | 150 | 150 |
| 31 | 31 | 71 | 71 | 111 | 111 | 151 | 151 |
| 32 | 32 | 72 | 72 | 112 | 112 | 152 | 152 |
| 33 | 33 | 73 | 73 | 113 | 113 | 153 | 153 |
| 34 | 34 | 74 | 74 | 114 | 114 | 154 | 154 |
| 35 | 35 | 75 | 75 | 115 | 115 | 155 | 155 |
| 36 | 36 | 76 | 76 | 116 | 116 | 156 | 156 |
| 37 | 37 | 77 | 77 | 117 | 117 | 157 | 157 |
| 38 | 38 | 78 | 78 | 118 | 118 | 158 | 158 |
| 39 | 39 | 79 | 79 | 119 | 119 | 159 | 159 |
| 40 | 40 | 80 | 80 | 120 | 120 | 160 | 160 |

Scorer ______________________
Assistant scorer ______________________
Timekeeper ______________________
24" operator ______________________

Scores After period ① A ____ B ____
After period ② A ____ B ____
After period ③ A ____ B ____
Before extra periods A ____ B ____

Referee ______________________
Umpire 1 ____________ Umpire 2 ____________
Coach signature in case of protest ______________________

Final Score Team A ____ Team B ____
Name of winning team ______________________

## سەرچاوەکان


أ- القانون الدولي لكرة السلة (٢٠١٠)–الحكم الدولي/ مؤيد سامي عباس
الحكم الدولي/ د. علي سموم فرطوسي

ب- تعديلات كرة السلة – الحكم الدولي/ مؤيدسامي عباس

## پرسیارەکانی پێداچوونەوەی یاسایی

## تۆپی سەبەتە

پ١/ درێژی و پانی یاریگا نیو دەوڵەتی تۆپی سەبەتە چەندە ؟

پ٢/ دوری هێلی هەڵدانی تۆمارکردنی (٣) سێ خالی لە خالی ستونی لە ژێر چەقی ناوەراست چەندە ؟

پ٣/ ژمارەی فانیلەی یاریزانان لە ژمارە چەندەوە دەست پێدەکات ؟

پ٤/ تیپ دەتوانێ چەند یاریزانی ژمارە فانیلەکانیان لە سەروی ژمارە (١٥) بێت ؟

پ٥/ باسی دوو لە کارەکانی سەرۆکی تیپ (کابتن) بکە ؟

پ٦/ چەند خولەك پێش دەست پێ کردنی یاری پێویستە راهێنەر لیستی ناوی یاریزانان پێشکەش بە داوەری مێز بکات ؟

پ٧/ یاری لە چەند (چارێك) پێك دێت ؟

پ٨/ پشووی نێوان چارێکی دووەم و سێ یەم چەند خولەکە ؟

پ٩/ یاری تۆپی سەبەتە چۆن دەست پێدەکات ؟

پ١٠/ کەی تۆپ بە مردوو دادەنرێت دوو بار ( حالات ) باس بکە ؟

پ١١/ هەڵدانی سەربەست (رمية الحرة) بە چەند خاڵ دەژمێردرێت ؟

پ١٢/ لە کۆی چارێکی یەکەم و دووەم چەند کاتی دابراو هەیە؟

پ١٣/ هەر تیپێك دەتوانێ چەند گۆرانکاری بکات لە یاری ؟

پ١٤/ دۆراندن بە کشانەوە چی یە ؟ باسی بکە .

پ١٥/ پێناسەی سەر پێچی ( المخالفة) بکە ؟

پ١٦/ سێ جۆر سەرپێچی (المخالفة) بژمێرە؟

پ١٧/ هەڵە (الاخطاء) چی یە باس بکە . جۆرەکانی هەڵە بژمێرە ؟

پ١٨/ سزای هەڵەی هونەری ( خطأ الفني ) چی یە . وە بە هێمای چی لە تۆمار دەنوسرێت ؟

پ١٩/ یاریزان بە چەند هەڵە یاریگا بەجێ دەهێلێت ؟

پ٢٠/ ئەو جل و بەرگانەی تایبەتن بە داوەر چین ؟

پ٢١/ کات ژمێر بۆ چی بەکاردێت وە چەند جۆر کاتمان هەیە ؟

پ٢٢/ باسی ئەرکەکانی داوەری یەکەم بکە ؟

پ٢٣/ کارەکانی داوەری مێز باس بکە ؟

پ٢٤/ کەی کاتی یاری دەست پێ دەکات ؟

پ٢٥/ کەی کات دەوەستێت ؟

# بەشی دووەم

# پوختەیەك لە یاسای یاری تۆپی باڵە



## یاساكانی تۆپی باڵە

### مادە-١- ناوچەی یاری (منطقة اللعب):

ئەوە دەگرێتەوە (یاریگا و ناوچەی ئازاد) و دەبێ لاكێشەبێت و وەكو یەك بێت.

### درێژی و پانی ( الابعاد )

زەوی یاریگا بریتییە لە لاكێشەیەك درێژیەكەی (١٨م)، وە پانیەكەی (٩م)ە. وەلە دەورو بەری ناوچەی ئازاد هەیە تاكو (٥)م لە هێڵەكانی تەنیشت و (٨)م لە هێڵەكانی دواوە و هیچ بەربەستی (عوائق) تیدا نەبێت. وە بەرزایی ناوچەی ئازاد دەبی (٧)م كەمتر نەبێت بۆ یارییەكانی نێو دەولەتی كەیەكیەتی تۆپی باڵەی نێو دەولەتی رێكی دەخات دەبێ ( ١٢,٥م) كەمتر نەبێت.

### هێڵەكانی یاریگا ( خطوط الملعب )

دەبێ هەر هەموو هێڵەكانی یاریگا بەپانی (٥سم) بێت وە بە رەنگی كراوە (فاتح) و جیاواز بێت لەگەڵ رەنگی زەوی یاریگا و هێڵەكانی تر.

### هێڵی ناوەراست ( خط المنتصف )

ئەم هێڵە یاریگای دەكاتە دوو یاریگای یەكسان( ٩×٩ )م وە پانی ئەم هێڵەش هەر (٥)سم و ئەم هێڵە لە ژێر تۆر دەروا لە هێڵی تەنیشت تاكو هێڵی تەنیشت

### هێڵی هێرشبەر ( خط الهجوم )

ئەم هێڵە ناوچەی پێشەوە دیار دەكات بە درێژی (٣)م دەكێشرێت لە هێڵی ناوەراست

### ناوچەی سێرڤ ( منطقة الارسال )

ئەم ناوچەیە بە پانی (٩)م بشت هێڵی كۆتایی دیار دەكرێت بە دوو هێڵی كورت هەریەكە (١٥)سم رەسم دەكرێت پاش (٢٠)سم لە هێڵی كۆتایی درێژ دەكرێت وەكو تەواوكەری دوو هێڵی تەنیشتەكان وەهەردوو هێڵە كورتەكان بە ناوچەی سێرڤ دەژمێرێت.

## مادە -٢- تۆر و ستونەکان :

### ١- بەرزی تۆر ( ارتفاع الشبکة )

تۆر دادەنرێت لە سەر هێلی ناوەراست و بەرزایی تۆر ٢,٤٣م بۆ پیاوان و ٢,٢٤م بۆ ئافرەتان.

### ٢- دوو داری هەوانی ( العصاتان الهوائیتان )

داری هەوائی بریتیە لە پارچە دارێکی نەرم درێژی ١,٨م و پانی (١٠)ملم دروست کراوە لە مادەی پلاستیکی شوشەیی (الألیاف الزجاجیة) .

دەبەسترێت لەگەل تۆر لەسەر دوو هێلی تەنیشت یاریگا (١) یەك مەتر لەگەل تۆرە و (٨٠)سم لەسەر تۆرەکە دەبێت و لەسەر تۆر ئەو دارە رەنگاورەنگ دەبێت هەر پارچە رەنگی دژی رەنگی تر دەبێت و درێژی پارچە رەنگەکە (١٠)سم دەبێت واباشە رەنگی سوور و سپی بێت. تۆپ لە ناو ئەو دوو دارە هاتووچۆ دەکات.

### ٣- تۆر ( الشبکة )

پانی تۆر یەك مەتر دەبێت و درێژی ٩,٥دەبێت لەگەل ٢٥سم لە هەر لایەك زیاد دەکات لە سەر هێلەکانی تەنیشت چونکە پانی یاریگا (٩)م ئەو زیادەیە بە شریتی (قماش) سپی بە پانی ٥سم دیاری دەکرێت.

## ٤-ستونەكان ( العمودان – القائمان )

دادەنرێت و تۆری لێ دەبەسترێت بە دووری ٥٠-١٠٠سم لە دوو هێڵی تەنیشت لە یاریگا وە بەرزی ستون لەسەر زەوی یاریگا ٢,٥٥م دەبێت.




وێنەی تۆر و ستونەكان

پانی تۆر (١)م و درێژی تۆر (٩,٥) م بەرزی ستون لەسەر زەوی یاریگا (٢,٥٥)م

## مادە -٣- تۆپ:

دەبێ تۆپ خر بێت دروست كرا بێت لە پێستەی نەرم یان پێستەی پیشە سازی وە لە ناوی كیسەیەك هەیە دروست كراوە لە (مطاط)




وە دەبێت رەنگی زەرد و شینی تۆخ بێت (نیلی).

١- چێوەی تۆپ (محیط الكرة): (٦٥-٦٧)سم

٢- كێشی تۆپ (وزن الكرة): (٢٦٠-٢٨٠)گرامە

٣- پالە پەستۆی هەوای ناو تۆپ: (٠,٣٠-٠,٣٢٥)كگم/سم٢ یان (٢٩٤,٣-٣١٨,٨٢)ملیبار یان هكتو باسكال

٤- لە كاتی یاری كردندا دەبێت هەموو ئەو تۆپانەی كە بەكاردێت هەمان چێوە و كێش و پالە پەستۆی ناو تۆپ و جۆر و رەنگیان وەكو یەك بێت.

ماده -٤- بەشدار بووان : المشاركون

تیپەكان: الفریق

❖ پێكهاتەی تیپ: تكوین الفریق

تیپ لە (١٤) یاریزان پێك دێت لەگەڵ ڕاهێنەر و یاریدەدەری ڕاهێنەر و (ممرن) و دكتۆری ئامادەمیزاد

- دەبێت یاریزانێك ببێتە سەرۆكی تیپ بەلام یاریزانی بەرگری ئازاد (لیبرو) نەبێت.

دەبێت ئاماژەی پێ بكرێت لە فۆرمی یاری

- یاریزانان دەبێت فانیلە و شۆرت و گۆرەویی و پێڵاوی وەرزشی یان لە بەر بێت لە كاتی یاری كردندا
- دەبێت ژمارەی فانیلەكانی یاریزانان لە (١-٢٠)بێت وە لە سنگ و پشت نوسرا بێت
- نابێت بە تراكسوت یاری بكەن. وە ئەگەر كەش و هەوا زۆر سارد بێ دەبێ هەمان ڕەنگ و ژمارەی لەسەر بێت.
- نابێت هیچ شتێكی لەبەر بێت كە یاریزان تووشی پیكان بكات.
- دەبێت یاریزان چاویلكەی لە چاو بكات لە سەر بەر پرسیاری خۆی.

ماده -٥- سەركردەكانی تیپ: قادة الفرق

❖ سەرۆكی تیپ : رئیس الفریق

سەرۆكی تیپ و ڕاهێنەر بەر پرسیارن لە هەڵسوكەوت و ڕەوشتی گشت یاریزانان

- نابێت یاریزانی بەرگری ئازاد (لیبرو) ببێت بە سەرۆكی تیپ.
- پیش یاری سەرۆكی تیپ واژوو دەكات لە فۆرمی یاری وە نوێنەری تیپەكەی خۆی دەبێت لە تیر و پشك
- ئەگەر سەرۆكی تیپ لە كاتی یاری گۆرا چووە دەرەوەی یاریگا لە هەر گێمێك بێت ئەوا دەبێ ڕاهێنەر یاریزانیكی تر دەست نیشان بكات بە سەرۆكی گێم. لەسەر فانیلەكەی سەرۆكی تیپ شریتێك بە پێوانەی (٢- ٨) سم لەژێر ژمارەكە دادەنرێت لەسەر سنگی بۆ ئاماژەی كاپتن.

❖ ڕاهێنەر: المدرب

ڕاهێنەر دەتوانێ گشت ڕینمایەكانی خۆی و چاككردنەوەی هەڵكانی یاریزانان چاك بكاتەوە بە قسە لە دەرەوەی یاریگا.

- ڕاهێنەر واژوو دەكات لەسەر فۆرمی یاری پێش ئەوەی یاری دەست پێ بكات وە دڵنیا دەبێت لە ژمارەی یاریزانان و ناویان.
- ڕاهێنەر بۆی هەیە داوای گۆرانكاری و كاتی پچراو بكات. وە دەبێت پێش دەست پێ كردنی هەر گێمێك پسوولەی جێگا و ژمارەی ڕاوەستانی یاریزانان بدات بە ناو بژیوانی دووەم.

❖ یاریدەدەری ڕاهێنەر : مساعد المدرب

یاریدەدەر دادەنیشی لە تەنیشت ڕاهێنەر و هیچ مانی نیە.

**ماده -٦- تۆماری خاڵ و بردنەوەی گێمیك ویاری: تسجيل نقطةوالفوز بالشوط والمباراة**

❖ **خاڵ:** تیپ خاڵ تۆمار دەکات لە کاتی:

- تۆپ بە زەوی یاریگای تیپی بەرامبەر دەکەوێت
- یان تیپی بەرامبەر هەڵەیەك بكات
- یان تیپی بەرامبەر ئاگاداری (انزار) وەربگرێت بە کارتی سوور.
- تیپی بەرامبەر هەر هەڵەیەك بكات دژی یاساکانی یاری تۆپی بالە بێت ئەوەش ناوبژیوانان رەچاوی دەکەن.

❖ **بردنەوەی بە گێم : الفوز بالشوط**

- ئەو تیپەی (٢٥)خاڵ تۆمار دەکات ئەوا گێمیك دەباتەوە بە مەرجێك (٢) خاڵ جیاوازی هەبێت وە(٢٥-٢٣) (٢٦-٢٤) (٢٧-٢٥)بەلام لە گێمی پێنجەم لە (١٥)خاڵ تەواو دەبێت هەر بە هەمان شێوەی جیاوازی (٢)خاڵ.

❖ **بردنەوە لە یاری : الفوز بالمباراة**

- هەر تیپێك (٣)گێم بباتەوە ئەوە یارییەکە دەباتەوە.
- ئەگەر هاتوو بەرامبەر بوون (٢-٢)گێم. ئەوە گێمی یەکلاکردنوەی یاری دەکەن بەلام لە (١٥)خاڵ کۆتایی دێت بە جیاوازی (٢) دوو خاڵ.

**ماده -٧- شێوەی یاری: نظام اللعب**

❖ **تیر و پشك: القرعة**

ناوبژیوانی یەکەم تیر وپشك دەکات نێوان دوو سەرۆکی تیپ بۆ ئەوەی دیاری بكات شوینی تیپەکان و سێرڤ لیدان و پیشوازیکردن لەتۆپ.

- براوەی تیروپشك: هەلدەبژیری:

١. یان سێرڤ لیدان یان پیشوازی سێرڤ.

٢. یان لایەکی یاریگا: لێرەدادۆراو هەلبژاردنی تر وەردەگرێت

لە گێمی(٥) گێمی یەکلاکەرەوە تیروپشک تازە دەبێتەوە دەبێ دووبارە تیروپشک بکرێتەوە.

❖ **گەرم بوونەوە: الاحماء**

پیش یاری ناوبژیوان ٦-١٠خولەك دەداتە هەر دوو تیپ گەرم بوونەوە بكەن لەسەر تۆر.

شەش یاریزان لەهەر تیپ لە ناو یاریگا دەبێت پێشی سێرڤ لیدان.

❖ **هەڵەی بنکە : خطاالمركز**

هەر تیپێك هەلەی بنکەی دەکات ئەگەر هاتوو یاریزان لە بنکەی خۆی نەبێت لە کاتی لێدانی سێرڤ.

❖ **سوورانەوە: دوران**

ئەگەر هاتوو تیپێك ماف سێرڤ لیدانی وەرگرت ئەوا یاریزانان یەك بنکە دەسوورینەوە لەگەل میلی کاتژمێر.

❖ هەڵەی سوورانەوە : خطأ دوران

تیپ هەلەی سوورانەوە دەکات ئەگەر هاتوو سێرڤ لێدان بە گوێرەی زنجیرەی سوورانەوە نەبێت. لێرەدا سێرڤەکە دەدۆڕێت و شوێنی یاریزانان چاك دەکرێتەوە.

ماده -٨-گۆڕانکاری یاریزانان : تبديل اللاعبين

- هەر تیپێك ماف (٦) شەش گۆرانکاری یاسایی هەیە لە هەر گیمێك بێجگە لە یاریزانانی (لیبرو).
- بۆی هەیە یاریزانی بنەرەتی (أساسي) بگۆرێ بە یاریزانی یەدەك (الاحتياطي البديل)وەبگەرێتەوە ناو یاریگا بەلام بۆ شوێنی خۆی لەگەڵ ئەو یاریزانەی چووبوە شوێنی و یەك جار لە هەر گێم.

❖ گۆڕانکاری ناچاری : التبديل الاستثنائي

ئەگەر هاتوو یاریزانیك تووشی پێکان هات لە کاتی یاری و نەیتوانی بەردەوام بێ لە یاری کردن ئەوا بۆی هەیە بگۆرێ بە گۆرانکاری یاسایی (بێجگە لە یاریزانی لیبرو) ئەگەر ئەوە ئیمکان نەبوو لێرەدا گۆرانکاری ناچاری دەبێت لەگەل هەر یاریزانێك تەنها یاریزانی (لیبرو) نەبێت گۆراوی (لیبرو)ش.

❖ گۆڕانکاری بەهۆی دەرکردن و دوورخستنەوە : التبديل بسبب الطرد او الستبعاد

دەبێ یاریزانی دەرکراو یان دوور خراو کار بگۆرێت بەگۆرانکاری یاسایی (تبديل قانوني) ئەگەر ئەوا ئیمکان نەبوو. بریار دەدرێ بە ناتەواوی تیپ (يعلن الفريق غير مكتمل) چونکە بە هیچ شێوەیەك نابێت تیپ بە (٥)پێنج یاریزان یاری بکات یان کەمتر تەنها بە (٦)شەش یاریزان یاری دەکات.

ماده -٩- جولانەوەی یاری : حركات اللعب

❖ تۆپ لە یاری : الكرة في اللعب

پاش فیکە لیدانی ناوبژیوان بۆ لیدانی سیرڤ لە کاتی کە تۆپ لە دەست یاریزان دەردەچی بۆ لیدانی سیرڤ لەو کاتی تۆپ لە یارییە.

❖ تۆپ لە دەرەوەی یاری : الكرة خارج اللعب

تۆپ لە دەرەوەی یاری دەبێت لەو کاتی هەلە روودەدات و ناوبژیوانی یەکەم یان دووەم فیکە لێدەدات. یان هەلەشی نەبێت لە کاتی فیکەی ناو بژیوان.

❖ تۆپ لە ناو یاریگا یە : الكرة داخل

لە کاتی تۆپ بە زەوی ناو یاریگا و هێلەکانی دەورو بەری بکەوێت.

❖ تۆپ لە دەرەوەیە : الكرة خارج

ئەگەر(اذا)

١. ئەگەر بە تەواوی بەزەوی دەرەوەی یاریگا بکەوێت.

٢. بەلەشێکی (جسم) دەرەوەی یاریگا یان (سقف) یان بە ئادەمیزادێك لە دەرەوەی یاریگایە.

٣. بە دوو داری هەوائی (العصاتین الهوائیتین)یان گوریسەکان یان ستونەکان یان تۆر لە دەرەوەی شریتەکانی تەنیشت.

٤. بە تەواوی لە ژێر تۆر بڕوا.

## مادە -١٠- لێدانی تۆپ : ضربات الفریق

هەر تیپێك مافی ئەوەی هەیە (٣) سێ جار لە تۆپ بدات (بێجگە لە بلوك)

❖ لێدانی یەك لە دوای یەك : اللمسات المتتالیة

نابێت یاریزانێك دووجار لەسەر یەکتر لە تۆپ بدات (بێجگە لەکاتی بلوك)

❖ لێدانی یەك کات : اللمسات المتزامنة

دەبێت دوو یاریزان یان سێ لە هەمان کات لە تۆپ بدەن.

❖ لێدانی تۆپ بە یارمەتی : الضربة المساعدة

نابێت یاریزان لە ناو یاریگا یارمەتی وەربگرێ لە برادەرێکی خۆی یان هەر بەربەستێك یان لەشێك بۆ ئەوەی بگات بە تۆپەکە.

❖ خاسیەتی لێدان : خصائص الضربة

١. دەبێت تۆپ بە هەر شوێنێك بکەوێت لە لەش

٢. دەبێت تۆپ لێبدرێ نەوەك بگیرێت یان بهاوێژرێت.

٣. دەبێت تۆپ بەچەند پارچەی لەش بکەوێت بە مەرجێك لەهەمان کات بێت.

٤. لەکاتی بلۆك کردندا دەبێت یاریزان یان یاریزانان چەند جار دەست لە تۆپ بدات بە مەرجێك لە یەك جولانەوە بێت.

## تۆپ لەلای تۆر: الكرة عند الشبكة

- دەبێ تۆپ لە سەر تۆر هاتوو چۆ بکات ئەگەر لە سێرڤ بێت یان لەکاتی یاری کردندا بێت.
- ئەگەر تۆپ لە کاتی سێرڤ یان لە کاتی یاریدا بەسەر رۆخی تۆر کەوت لە سەرەوە و ئاوا بوو ئەوا یاری بەر دەوامە.
- نابێت لەکاتی یاری دا یاریزان قاچی بە تەواوی لە زەوی یاریگای تیپی بەرامبەر بدات.
- لەکاتی یاری دا ئەگەر تۆپ بە تۆر کەوت و گەراوە لە سنووری (٣)لێدان بێت ئەوا دەبێت.

- ئەگەر تۆپ لە کاتی یاری دا بەتۆر کەوت و چاوەکانی تۆر دراو یان تۆرەکە کەوت ئەوا ئەم خاڵە هەژمار ناکرێت و خاڵەکە دوو بارە دەکرێتەوە.

### مادە -١١-یاریزان لای تۆر: اللاعب عند الشبكة

### ❖ گەیشتن بۆ پشت تۆر: الوصول خلف الشبكة

- لەکاتی بلوك: ئەو یاریزانەی کە بلوك دەکات مافی ئەوەی هەیە دەست لە تۆپ بدات پشت تۆر بە مەرجێك تێکەل نەبێت لەگەڵ یاری تیپی بەرامبەر پێش و لەکاتی لێدانی هێرشی کۆتایی یان دوا هێرش (قبل أو أثناء الضربة الهجومية للأخير) بۆ یاریزانی بەرامبەر.
- دەبێت یاریزان دەستی درێژ بکاتە پشت تۆر بەمەرجێك لێدانە کە کرابێت لە بواری یاری خۆی.
- نابێت یاریزان پیێ یەکی یان هەردوو پیێ ی بە زەوی یاریگای بەرامبەر بکەوێت لەکاتی یاریدا .
- دەبێت یاریزان بە قاچێك یان هەردوو قاچ بە زەوی تیپی بەرامبەر بکەوێت بە مەرجێك بەشێك لە قاچی ئاوا کرا یان دوو قاچ یان یەکسەر لە سەر هێڵەکەبێت (إما ملامساً لخط المنتصف أو فوقه مباشرة).
- دەبێت یاریزان بچێتە ناو یاریگای تیپی بەرامبەر پاش ئەوەی تۆپ لە دەرەوەی یاری دەبێت.
- ئەوە هەلە نیە ئەگەر تۆپ بە تۆر کەوت و تۆرەکەش چووە دواوە بە یاریزانی تیپی بەرامبەر کەوت.

### مادە -١٢- سێرڤ: الارسال

- سێرڤ ئەو جولانەوەیە کە تۆپ لە یاری دادەنیێ بە هۆی یاریزانی دەستە راستی دواوە لە ناوچەی سێرڤ.
- یەکەم سێرڤ لەگیمی یەکەم هەروەها لە گێمی پێنجەم (الفاصل) بە پێی ئەو تیپەی کە تیرو پشك دیاری دەکات.
- لە گێمی دووەم ئەو تیپەی لە گێمی یەکەم سێرڤی لێنەدا سێرڤ لێدەدات و بە نوبەت (بالتناوب) لیدەدەن تاکو دەگاتە گیمی پێنجەم (سێرڤ دەبێ لە نێوان (٨) چرکە لێبدرێ).
- دەبێت یاریزانان یەك لە دوای یەك سێرڤ لێبدەن بە پێی ئەو پسوولەی ریکخستنی سورانەوەیە (ترتيب الارسال حسب ورقة ترتيب الدوران). و دەسورینەوە بە پێی میلی کاتژمێر.
- ئەگەر ئەو تیپەی کە سێرڤی لێدە و خاڵەکەی بردەوە سێرڤی دووەم هەمان یاریزان لیدەدات یان لەگەل ئەو یاریزانەی لەگەلی دەگۆرێت.
- ئەگەر تیپی بەرامبەر سێرڤەکەی بردەوە. ئەوا مافی دەبێت بۆ لێدانی سێرڤ وە دەسوورینەوە پیش لێدانی سێرڤ. وە ئەو یاریزانەی کە لە بنکەی راستەی پیشەوە دەچێتە بنکەی دواوەی راستە. سێرڤ لیدەدە.
- سێرڤ بە یەك دەست لیدەدرێ. نابی بەسەر یان بە قاچ یان بەدوو دەست لیێ بدریێ. دەبیێ تۆپیش لە دەست یاریزانی سێرڤ لێدەر دەربچیێ ئینجا بە دەستی دووەم یان دەستی تر لیبدە.

### ❖ هەڵەكانی سیرڤ: اخطاء الارسال

لەكاتی سیرڤ لێدان

١. ئەگەر یەك لەدوای یەك لێنەدرێ (مخالفة ترتیب الارسال)

٢. ئەگەر بەشیوەیەكی راست و دروست لیٚ نەدریٚ. وەكو:

أ- قاچی لەسەر هێڵی كۆتایی بێت.

ب-تۆپ لە دەستی دەرنەچیٚ.

ت-(٨)چركە زیاتر بخایێنیٚ.

پ-بە دوو دەست لیبدە.

ج-تۆپەكە فرێبدە (رمي الارسال لایجوز) یان تۆپەكە بهاوێژیٚ.

ح-بەسەر لیبدە.

خ-لە شوێنی سیرڤ لیدان سیرڤ لێنەدە.

### ❖ هەلەكان پاش سیرڤ لێدان:

سیرڤ بە هەلە دادەنریٚ ئەگەر

أ- بە یاریزانی تیپی سیرڤ لێدەر بكەوێت.

ب- لە بوارى سەر تۆرى ئاوا بوون ئەگەر تۆپەكە نەروات.

ت- سیرڤەكە بچێتە دەرەوەی یاریگا.

پ- ئەگەر ئاوابوو لەسەر شاردنەوەی سیرڤ (اخفاء الارسال).

ج- لە هەوا تۆپ بە (سقف) بكەوێت یان بە هەر لە شێكی تر بكەوێت (جسم خارجی).

### مادە -١٢- لیدانی هیرش كردن: الضربة الهجومية

هەر جولانەوە یەك بۆ ئاراستە كردنی تۆپ بۆ یاریگای بەرامبەر لیدانی هیرش كردنە (تەنها سیرڤ و بلوك كردن نەبێت).

- دەبیٚ بەردانەوەی (اسقاط الكرة) تۆپ لەكاتی لێدانی هیرش كردن بە مەرجێك ئەگەر لێدانەكە دیار بێت (الضربة واضحة) وە تۆپەكە نەگیرێت و فریٚ نەدریٚ(تمسك او ترمي).

### ❖ قەدەغەكانی لێدانی هیرش كردن: قيود الضربة الهجومية

أ- یاریزانانی ریزی پێشەوە ماڤ ئەوەیان هەیە هەلسن بە لیدانی هێرش كردن یان تۆپەكە تەواوكەن بۆ ئاوا كردنی یاریگای بەرامبەر لەسەر هەر بەرزایی یەك بە مەرجێك لیدانی هیرشەكە جێبەجیٚ بكرێت لە ناو یاریگای خۆی.

ب- یاریزانانی ریزی دواوە مافیان هەیە لیدانی هێرش كردن بەكار بهێنن لەسەر هەر بەرزایی یەك بێت بە مەرجێك لە دوای ناوچەی پێشەوە و نابێت قاچی (هەردوو قاچی) یاریزانانی هێرشبەر لەسەر هێلی

هێرش كردن (خط الهجوم)بێت.بەلام دەبێت پاش لێدانی هێرش كردن لە ناوچەی پێشەوە بێتە خوارەوە.

ت- نابێ یاریزانی (لیبرو) لێدانی هێرش كردن بكات لە هیچ ناوچەیەك وەنابێ یاریزانی لیبرو ئەو تۆپەی بەرز دەكاتەوە بە پەنجەكان لە ناوچەی پێشەوە هێرش بكرێت.

**مادە -١٤- بلۆك: (الصد)**

❖ **بلۆك كردن:**

بلۆك ئەو جولانەوەیە یاریزانانی نزیكن لە تۆر بۆ گەراندنەوەی ئەو تۆپەی كەلە لایەن یاریزانانی بەرامبەر دێت. ئەویش ئەوەیەكە یاریزانانی بەرگری بەرز بن بۆ بەرزترین شوێن بۆ ئەوەی لەسەر ئاستی قەراغی سەرەوەی تۆر بلۆك بكەن.

تەنها یاریزانانی هێلی پێشەوە مافی ئەوەیان هەیە بلۆك بكەن.

❖ **هەول دان بۆ بلوك: (محاولة الصد)**

ئەویش هەول دانە بۆ بلۆك كردن بێ ئەوەی یاریزان دەست لە تۆپ بدە.

❖ **بلۆك كردنی تەواو: (الصد المكتمل)**

بلوك كردن تەواو دەبێ ئەگەر یاریزان دەستی بە تۆپ بكەوێت

❖ **بلۆك كردن بە كۆمەل: (الصد الجماعي)**

جێبەجێ دەكرێت دوو یاریزان یان سێ نزیك بن لە یەكتر هەلستن پێكەوە بلۆك بكەن وە تەواو دەبێت ئەگەر بە دەستی هەر یەك لەم یاریزانانە بەتۆپ بكەوێت.

❖ **بلۆك كردنی سیرڤی: (صد الارسال)**

نابێت سیرڤی تیپی بەرامبەر بلوك بكرێت.

❖ **دەست بە تۆپ كەوتنی بلوك: (لمسة الصد)**

یاریزان مافی ئەوەی هەیە ئەگەر هاتوو چەند جار تۆپ بە دەستی بكەوێت یەك لە دوای یەك بە مەرجێك ئەو دەست پێكەوتنانە روو بدات لە كاتی یەك جولانەوە بێت.

❖ **بلوك كردن و لێدانی تیپ: (الصد و ضربات الفريق)**

دەست لیدان بە تۆپ لە كاتی بلوك كردن دا هەژمار ناكرێت بە لیدانی تیپ. لە بەر ئەوە هەر تیپێك مافی ئەوەی هەیە پاش دەست لێدان لە تۆپ لەكاتی بلوك كردن و (٣)سێ جار لە تۆپ بدات بۆ ئەوەی تۆپ بگەرێنێتەوە بۆ یاریگا بەرامبەر .

- وە دەبێت ئەو یاریزانەی كە هەلدەستێ بلوك دەكات لێدانی یەكەم (الضربة الاولى) بەكار بهێنێت.

### ❖ بلوك كردن لەناو يارِيگاى بەرامبەر : ( الصد داخل مجال المنافس )

ياريزان مافى ئەوەى هەيە لە كاتى بلوك كردندا دەستەكانى درێژ بكاتە پشت تۆر بۆ ناو يارِيگاى بەرامبەر بەمەرجێك تێكەل جولانەوەى تيپى بەرامبەر نەبێت. وە ئەوە نابێت دەست لە تۆپ بدە لە پشت تۆر الا پاش ئەوەى تيپى بەرامبەر ليدانى هێرشى خۆى جێبەجىَ بكات.

- نابێت ياريزانى هێلى دواوە و ياريزانى (ليبرو) بلوك بكەن . يان بەشدارى بكەن بە بلۆك كردنى بە كۆمەل و تەواو (المشاركة في الصد الجماعي المكتمل).

### ماده -١٥- راوەستانەكان و دواخستنەكان : ( التوقفات و التأخيرات )

- ژمارەى راوەستانى نۆرمال (عدد التوقعات العادية)هەر تيپێك ماڤ (٢) دووكاتى پچراوى هەيە لەگەل (٦)شەش گۆرانكارى لە هەر گێم.
- داواكارى راوەستانى نۆرمال (طلب التوقعات العادية) دەبىَ بە رێگاى راهێنەر داواكارى راوەستانى بكرىَ داواكارى دەكرێت بە دەربرينى ئاماژەى دەست (اظهار اشارات اليد الدالة) لەكاتى تۆپ لە دەرەوەى يارى دەبێت وەپيش ليدانى فيكەى ناوبژيوان بۆ سيرڤ لێدان.
- دەبێت راهێنەر ياريزانى بنێرێت بۆ ناوچەى گۆرانكارى بۆ ئەوەى گۆرانكارى ئەنجام بدرێت ئەوەش دەبىَ تۆمار بكرێت لە گۆرانكارى ياسايى لەو گێمە.

### ❖ راوەستانى يەك لە دواى يەك : ( التوقفات المتتالية )

هەر تيپێك ماڤ ئەوەى هەيە كە دوو كاتى پچراو وەيەك گۆرانكارى داوابكات لە هەمان راوەستان پيش ئەوەى يارى دەست پىَ بكات.

- نابێت تيپ داواكارى بۆ گۆرانكارى يەك لە دواى يەك بكات لە هەمان راوەستانى پچراو

بەلام تيپ ماڤ ئەوەى هەيە دوو ياريزان يان زياتر بگۆرىَ لە هەمان راوەستان پاش داواكارى بۆ گۆرانكارى.

### ❖ كاتەكانى پچراو :( الاوقات المستقطعة )

هەموو كاتەكانى پچراو (٣٠)سى چركە دەخايێنى.

### ❖ كاتەكانى پچراويى هونەرى : ( الاوقات المستقطعة الفنية )

بۆ يارييەكانى ئاستى زۆر بەرز وە ئەو يارى يانەى كە يەكيەتى تۆپى بالەى نێو دەولەتى سەرپەرشتى دەكات لە گيمى (١-٤) دوو كاتى پچراوى هونەرى هەيە پەيرەودەكرىَ ئۆتۆماتيكيان وەماوەكەى (٦٠)شەست چركەيە. لەكاتى تيپى پێشكەوتوو دەگاتە خالى (٨و١٦).بەلام لە گێمى پێنجەم كاتەكانى پچراوى هەونەرى نيە و پەيراو ناكرىَ چونكە لە خالى (١٥) گێم تەواو دەبێت. بەلام دووكاتى پچراو هەيە بۆ هەر تيپ داواى دەكات كەماوەكەى (٣٠)سى چركەيە.

- لەكاتى پچراو دەبىَ ياريزانان برۆنە دەرەوەى يارِيگا بۆ ناوچەى ئازاد لاى كورسى يەكانى يەدەگەكان.

## ❖ گۆڕانکاری یاریزان : ( تبديل لاعب )

- دەبێ گۆرانکاری بکرێت لە ناو ناوچەی گۆرانکاری.
- گۆرانکاری یاریزان کاتی نیە هەر ئەوەندە دەخاێنی دەرچوونی یاریزان و چوونە ژووری یاریزان بۆ ناو یاریگا و تۆمارکردنی ئەو گۆرانکاری یە.
- دەبێ یاریزانی گۆرانکراو (یان یاریزانان) لە کاتی داوا کردنی گۆرانکاری ئامادەبن بۆ چونە ناو یاریگا لە ناوچەی گورانکاری.
- ئەگەر یاریزان ئامادە نەبێت لە ناوچەی گۆرانکاری لە کاتی دواکردنی گۆرانکاری. ئەو گۆرانکاریە قەدەغەدەکرێت وەتیپەکە سزا دەدرێ بە دواخستنی یاری (تأخير اللعب).
- یاری ئاستی بەرز بوردی گۆرانکاری بەنمرە بەکار دێت بۆ ئاسان کردنی گۆرانکاری.

## مادە -١٦- دواخستنەکانی یاری : ( تأخيرات اللعب )

❖ هەر هەلوێستێکی هەڵە بۆ دواخستنی دەست پێ کردنی یاری وەکو:

- دوا خستنی گۆرانکاری یاریزان.
- درێژە پێدانی راوەستانی تر پاش ئەوەی کە داوای لێ دەکرێت دەست بە یاری بکات
- داوا کردنی گۆرانکاری نایاسایی (غير قانوني)
- دوو بارە کردنی داواکاری هەلە
- دواخستنی یاری لە رێگای ئەندامێکی تیپ.

## ❖ جەزاکانی دوا خستنەکان : ( جزاءات التاخيرات )

- دەبێت یاری دواخستن جەزای (سەرنج راکێشانی دواخستن بدرێتێ).
- بۆ جاری دووەم یاری دواخستن جەزای ئاگادارکردن دواخستن ( بەکارتی زەرد )بدرێتە تیپ (ئەوە سزایەش وەدەکا سيرڤ بدۆری) و خالێك بۆ تیپی بەرامبەر بنوسرێت.
- ئەو (جەزا)یانە کاری گەری دەمێنێت هەتاکو یاری تەواو دەبێت.
- گشت سزاکانی پێش دەست پێ کردنی یاری یان نێوان گیمەکان لە گیمی پاشتر تۆمار دەکرێت.

## مادە -١٧- راوەستانەکانی یاری بێجگە :( توقفات اللعب الاستثنائية )

## ❖ پیکان : الاصابة

ئەگەر رووداوێکی ترسناك رووی دا لەکاتی یاری تۆپەکەش لەیاری بوو. دەبێ ناوبژیوان یەکسەر یاری راگری وە رێ بدا یان بهێلێ دکتۆر بێتە ناو یاریگا بۆ چارەسەر کردنی یاریزانەکە. لە پاشان خاڵەکە دووبارە دەکرێتەوە.

- ئەگەر گورانكاری یاریزانانی پیكان هاتوو بەشێوەی {یاسایی (قانوني) یان بێجگە (استثنائي)}نەكرا یاریزان (٣) سێ خولوكی دەدرێتێ ئەو كاتە بۆ چارەسەركردنە بەلام نابێت لە جارێك زیاتر بدرێتە هەمان یاریزان.

ئەگەر چارە سەر نەكرا و چاك نەبووەوە ئاگاداری دەكرێت بەتەواو نەبوونی تیپ. (یعلن عدم اكتمال الفریق)

❖ چوونە ژووری دەرەكی: ( التدخل الخارجي )

ئەگەر هاتوو هەر چوونە ژوورەوەی دەرەكی لەكاتی یاری كردندا روویدات. یاری رادەوەستێت و خالەكە دووبارە دەكرێت.

❖ راوەستانی درێژ خایەن: ( التوقفات المطولة )

ئەگەر هاتوو روداوێكی فریاكەوتن (ظروف طارئة) لەكاتی یاری روویدات و وابكات یاری راوەستێت ئەوە ناوبژیوانی یەكەم و لیژنەی چاودێری و سەرپەرشتی یاری وا دەكەن هەر شتێك بگەرێتەوە ئاستی سروشتی خۆی.

- ئەگەر هاتوو راوەستانێك یان چەند راوەستان روو بدات بەكۆی هەمووی (٤)چوار كاتژمێر نەخایێنی:-

أ- ئەگەر لە هەمان یاریگا دەست پێ بكات. گێمەكە بەردەوام دەبێت بە شێوەیەكی ئاسایی بە هەمان ئەنجام و یاریزانان وە ناوچەكانیان. وە ئەنجامی گیمەكانی كە پێشتر یاری كراون وەكو خۆی دەمێنێتەوە.

ب- ئەگەر یاری گواستراوە یاریگایەكی تر و دەستی پێ كرد ئەوە ئەو گێمەكە تیدا راوەستان بوو هەلدەوەشیتەوە دووبارە گێمەكە دەست پێ دەكات بە هەمان ئەندامانی تیپەكەو وەهەمان راوەستان و ناوچەی یاریزانان (وقوف اللاعبین في ترتیب الدوران الاساسي) بنەرەتی وە ئەنجامی گێمەكانی تر كە یاری كراون وەكو خۆی دەمێنیتەوە.

ت- ئەگەر راوەستانێك روویدات یان چەند راوەستانێك بۆ ماوەی زیاتر لە (٤) چوار كاتژمێر. دەبێ ئەو یارییە دووبارە بكرێت. (تعاد المباراة بالكامل).

### مادە -١٨- ماوەی حەسانەوە و گۆرینی یاریگاكان: فترات الراحة و تغیر الملاعب

- ماوەی حەسانەوە نێوان گشت گێمەكان (٣) سێ خولەكە.لەو ماوەیە دەبێ یاریگاكان بگۆرێت وە زنجیرەی سوورانەوەی (ترتیب الدوران) تۆمار بكرێت بۆ هەردوو تیپ لە فۆرمی یاری.

❖ گۆرینی یاریگاكان : تغییر الملاعب

تیپەكان یاریگاكانیان دەگۆرن پاش تەواو بوونی هەر گێمێك تەنها گێمی پێنجەم نەبێت. پاش تەواو بوونی گێمی چوارەم ئەگەر ئەنجامەكە دوو گێم بوو بۆ هەر دوو تیپ. دەبێ ناوبژیوانی یەكەم تیروپشك بكات بۆ دیاری كردنی یاریگای هەر دوو تیپ و سیرڤ لیدەر و پێشوازی لە تۆپ كردن.

- له گێمی پێنجەم لەو کاتی هەر تیپێك دەگاتە خاڵی (٨)هەشتەم دەبێ هەر دوو تیپ بێ دواکەوتن یاریگاکانیان بگۆرن بەلام ناوچەکانی یاریزانان وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

ماده -١٩- یاریزانی بەرگری ئازاد (لیبرۆ) : اللاعب المدافع الحر

- هەر تیپێك ماف ئەوەی هەیە یاریزانێك (٢)تۆمار بکات وەکو یاریزانی بەرگری ئازاد (لیبرۆ) له لیستی (١٢) دوانزە یاریزان.
- دەبێ یاریزانی بەرگری ئازاد تۆمار بکرێت له فۆرمی یاری پێش دەست پێ کردنی یاری له شوینی تایبەتی دیاری کراو بۆی. وەدەبێ ژمارەی یاریزانی (لیبرۆ) بنوسرێت له کاغەزی زنجیرەی سوورانەوەی هەر پێنج گێم. به پێچەوانەوە راهینەر ناتوانی یاری پێ بکات.
- نابیت یاریزانی بەرگری ئازاد سەرۆکی تیپ بێت هەروەها نابێت ببێتە سەرۆکی گێم ئەگەر سەرۆکی تیپ بچێتە دەرێ و بگۆری لەگەل یاریزانیکی تر.
- دەبێ یاریزانی بەرگری ئازاد جل و بەرگی به تایبەتی فانیلەی جیاواز بێت لەگەل یاریزانانی تر بەلام دەبێ ژمارەی لەسەر فانیلەی هەبێ وەکو یاریزانەکانی تر.

❖ جولانەوەی یاریزانی لیبرۆ :الحركات المسموحة لليبرو

جولانەوەی یاری : حركات اللعب

- یاریزانی لیبرۆ بۆی هەیە بگۆریت لەگەل هەر یاریزانیکی ریزی دواوە.
- دەبێ وەکو یاریزانانی ریزی دواوە یاری بکات و نابێ جولانەوەی هێرشبەری بکات یان (كبس) لیبدات له هەر ناوچەیەك بیت پیشەوە یان دواوە یان ناوچەی ئازاد.
- نابێت سیرڤ لیبدات یان بلوك بکات یان هەوڵدانی بلۆك بکات.
- یاریزان ماف نیە تۆپ (كبس) بکات ئەگەر له ئاستی سەرەوەی تۆرەکە یاریزانی لیبرو به پەنجەکانی تۆپ بەرز بکاتەوە لەناوچەی پیشەوە بۆ هیرش بردن (كبس) کردن.

بەلام ماف ئەوەی هەیە بەپەنجەکانی تۆپ بەرز کاتەوە بۆ هیرش بردن لەناوچەی دواوە.

❖ گۆرانکاری یاریزانی بەرگری ئازاد هەژمار ناکرێ به گۆرانکاری یاسایی یان نورمەل.

گۆرانکاری یەکەی سنووری نیه بەلام بێتە دەرەوەی یاری دەبێ خاڵێك له سەر یاری بروا خاڵەکە بۆ هەرتیپێك بێت ئینجا دەتوانی بێتەوە ناو یاریگا.

❖ گۆرانکاری جێبەجێ دەکرێت لەوکاتی که تۆپەکە له دەرەوەی یاری دەبێت.

❖ له سەرەتای هەر گیمێك ناتوانی (لیبرۆ) بچێتە ناو یاریگا هەتاکو ناوبژیوانی دووەم ووردبینی دەکا لەسەر پسوولەی زنجیرەی راوەستانی بنەرەتی.

❖ گۆرانکاری (لیبرۆ) رەت ناکرێتەوە پاش فیکەی ناوبژیوان بۆ سیرڤ لیدان بەلام پیش لیدانی سیرڤ. بەلام سزنج راکیشان زارەکی وەردەگیرێت لەلایەن ناوبژیوان پاش کۆتایی هاتنی خاڵەکە لەپاشان ئەگەر دووبارە کراوە سزای (دواخستن) وەردەگری.

- یاریزانی (لیبرۆ) گۆرانکاری دەکا لە هێڵی تەنیشت بەرامبەر شوێنی دانیشتنەکانی یاریزانانی یەدەك نێوان هێڵی هێرشبردن و هێڵی کۆتایی.
- **دووبارە دەست نیشان کردنی یاریزانی بەرگری ئازاد : اعادة تعيين لاعب المدفع الحر**

لە کاتی پێکانی یاریزانی بەرگری ئازاد (لیبرۆ) بە رەزامەندی ناوبژیوانی یەکەم. راهێنەر دەتوانی یاریزانێکی تر دەست نیشان بکات بۆ (لیبرۆ) لەو یاریزانانەی کە ناو یاریگا نین (لە یەدەگەکان) بەلام نابێت ئەو یاریزانەی کە تووشی پێکان هات دووبارە بگەڕێتەوە ناو یاریگا ببێتە لیبرۆ.

- دەبێ ئەو یاریزانەی نوێ دەست نیشانکرا بە لیبرۆ بمێنێت بە لیبرۆ تاکو کۆتایی هاتنی یارییەکە.

### مادە -٢٠- هەلسوکەوتی بەشدار بووان : ( سلوك المشاركين )

#### هەلسوکەوتی وەرزشی : ( سلوك الرياضي )

- دەبێ هەموو بەشداربوان یاسای فەرمی تۆپی بالە بزانن وە پەیرەوی بکەن.
- دەبێ هەموو بەشداربوان رەزامەندی دەربڕن بۆ بڕیارەکانی ناو بژیوانان. ئەگەر هاتوو گومان هەبێ سەرۆکی تیپ داوا بکات و ناوبژیوان دەبێ روون بکاتەوە
- دەبێ هەموو بەشداربوان دوورکەون لە جولانەوەو هەلویستی ناشیرین کە کاری گەری هەبیت لەسەر بریارەکانی ناوبژیوانان یان شاردنەوەی هەلەکانی تیپەکەی خۆیان دەیکەن.

### مادە -٢١- رەوشتی خراپ و سزاکانی : ( سوء السلوك و جزاءاته )

- **رەوشتی ناشیرینی ئاسان : سوء السلوك البسيط**

رەوشتی ناشیرینی ئاسان واناکات ئەندامانی تیپ توشی سزای توند ببێ بەلام ناوبژیوانی یەکەم سەرنج راکیشانی دەدات (توجيه لفت نظر شفهي) یان ئاماژەی پیدەدات لە رێگای سەرۆکی تیپ.

- **خشتەی سزاکان : ( جدول الجزاء )**

بەپێی رەچاوی ناوبژیوانی یەکەم وە بەپێی ئاستی ترسناکی هەڵوێست سزاکان سێ جۆرن:-

- **ئاگادارکردنەوە: الانذار {کارتی زەرد}**

بۆ هەلسوکەوتی نا پەروەردەیی یەکەم لە یاری لەلایەن هەر ئەندامی تیپ سزاکەش تۆپ دەدۆرێنی وە خالێك دەنوسرێت بۆ تیپی بەرامبەر .

- **دەرکردن : الطرد {کارتی سوور}**

نابێت ئەندامی تیپ کە دەردەکرێ یاری بکات تاکو کۆتایی هاتنی گێمەکە. وەدەبێ دانیشێ لە ناوچەی سزا بەبێ هیچ ئەنجامی تر.ئەگەر رەفتاری دوژمنایەتی یان ووشەی ناشیرین یان جولانەوەی خەراپ بەکاربهێنێ .

- **دوور خستنەوە : (الاستبعاد) {كارتی سوور و زەرد پێکەوە}**

دەبێ ئەو ئەندامەی دوور دەخرێتەوە بچێتە دەرەوەی یاریگا تاکو یاریەکە تەواو دەبێت بەبێ هیچ ئەنجامێکی تر.

- ئەگەر لە هەر ئەندامێکی تیپ رەوشتی خراپ روویدا سزای وەرگرت پێش ئەوە یاری دەست پیێ بکات یان لە نێوان گێمەکان ئەوە لە گێمی داهاتوو سزایەکە پەیرەو دەکرێت.

**مادە -٢٢- دەستەی ناوبژیوانان : (هيئة التحكيم)**

دەستەی ناوبژیوانان لە یاری پێك دێت بەفەرمی یەکان لە مانەی داهاتوو:-

- ناوبژیوانی یەکەم
- ناوبژیوانی دووەم
- نوسەر {لە یاری نێو دەولەتی دەبێ یاریدەدەری هەبێ}
- چوار (دوو) چاودێرانی هێل

- تەنها ناوبژیوانی یەکەم و دووەم ماف ئەوەیان هەیە کە فیکە (الصافرة) لێبدەن لە کاتی یاری.
- ئەگەر ناوبژیوانی یەکەم فیکەی لێدا لەسەر هەلەیەك دەبێ ئامازە بدە بەو شتانەی خوارەوە:-
  - ئەو تیپەی کە سیرڤ لێدەدا.
  - جۆری هەڵە
  - ئەو یاریزانەی کە هەڵەی کردووە (ئەگەر پێویست بێ)

پاشان ناوبژیوانی دووەم ئامازەکانی ناوبژیوانی یەکەم دووبارە دەکاتەوە.

- ئەگەر ناوبژیوانی دووەم فیکەی لێدا لەسەر هەلەیەك دەبێ ئامازە بکا بۆ:-
  - جۆری هەڵە
  - ئەو یاریزانەی کە هەڵەی کردووە (ئەگەر پێویست بوو)
  - دووبارە کردنەوەی ئامازەی ناوبژیوانی یەکەم بۆ ئەو تیپەی کە سیرڤ لێدەدا.

**مادە -٢٣- ناوبژیوانی یەکەم : (الحكم الاول)**

**بەرپرسیەکان : (المسؤوليات)**

- ناوبژیوانی یەکەم هەلدەستی پیش یاری:-
  - پشکنینی چونیەتی ناوچەی یاری و تۆر و تۆپەکان
  - جێبەجێ کردنی تیروپشك نێوان دوو سەرۆکی تیپ
  - تەنها ناوبژیوانی یەکەم ماف هەیە لە کاتی یاری:-

سزادانی سەرەنج راکیشان بۆ هەر دوو تیپ بدات وە سزادانی هەلویستی ناشیرن و خراپ و دواخستنی یاری.

❖ هەروەها بریار دەدا دەربارەی:-

أ- هەڵەکانی سێرڤ لێدان و ناوچەکانی تیپی سێرڤ لێدەر (مراكز الفريق المرسل) وە لەگەڵ شاردنەوەی سێرڤ

ب- هەلەکان لە یاری تۆپ.

ت- هەلەکان لە سەر تۆر وەپارچەی سەرەوەی تۆر.

پ- لێدانی هێرشبردن بۆ یاریزانی (لیبرۆ) و لیدانی هێرشبردنی هەلە بۆ یاریزانانی ریزی دواوە.

ج- ئاوە بوونی تۆپ لە ژێر تۆر.

ح- لیدانی (كبس) لە یاریزانێك ئەگەر تۆپەکە بە پەنجە بەرزکرابێت لە ناوچەی پیشەوە لەلایەن یاریزانی (لیبرۆ).

❖ پاش تەواو بوونی یاری. وورد بینی فورمی یاری دەکات وە واژوو دەکات.

## مادە -٢٤- ناوبژیوانی دووەم: ( الحكم الثاني )

### ❖ شوێنی : ( الموقع )

ناوبژیوانی دووەم هەلدەستێ بەجێبەجێ کردنی ئەرکەکانی بەراوەستان لە دەرەوەی یاریگا نزیك ستون (العمود) لەلای بەرامبەر ناوبژیوانی یەکەم.

### ❖ حوکم رەوانی: ( السلطة )

- مافی هەیە ئاماژە بکات (الاشارة) بەبێ ئەوەی فیکە لیبدات بۆ هەلەکان لە دەرەوەی حوکم رەوانی ئەو. بەلام مافی نیە سوور بێت لەسەری بەرامبەر ناوبژیوانی یەکەم.
- چاودیری ئیش کردنی نووسەر یان نووسەران دەکات.
- سەرپەرشتی ئەندامانی هەردوو تیپ دەکات کە لەسەر (مسطبة) دادەنیشن و ئاگاداری (يبلغ) ناوبژیوانی یەکەم دەکات لە کەم و کوری هەلسوکەوتیان.
- چاودێری یاریزانان دەکات لە ناوچەی گەرم بوونەوە.
- رەزامەندی دەردەبری بۆ راوەستانەکانی یاری (التوقفات) وەچاودیری ماوەکەی دەکات، وە رەت دەکاتەوە (يرفض) داواکاریەکانی هەلە. هەروەها چاودێری ناوچەی سزا دەکات.

❖ چاودیری ژمارەی کاتەکانی پچراو (الاقات المستقطعة) وەگۆرانکاریەکانی (التبديلات) هەر دوو تیپ و ئاگاداری ناوبژیوانی یەکەم و راهینەرەکان دەکات پاش کاتی بچراوی دووەم و گۆرانکاری پێنجەم و شەشەم.

❖ رێ پێدەدات (يسمح) لەکاتی پیکانی (إصابه) یاریزان بە گۆرانکاری یاسایی یان بێجگە (استثنائي) یان (٣) سێ خولەك بدات بۆ چارەسەرکردن ئەگەر تیپ یاریزانی یەدەگی نەبوو.

## لێپرسراویەتییەکانی دووەم: ( المسؤوليات )

- دلنیا دەبێت لە پێش دەست پێکردنی هەر گێمێك لە شوێن و ناوچەی یاریزانەکانی ناو یاریگا بەپێ ی پسوولەی زنجیرەی سوورانەوە (ورقة ترتيب الدوران).
- بڕیار دەدا لە کاتی یاری و فیکە لێ دەدا.

- ئاوا بوونی قاچ یان قاچەکانی یاریزانان لە کاتی یاری بۆ یاریگای تیپی بەرامبەر لە ژێر تۆڕ.
- هەڵەکانی ناوچە بۆ تیپی پێشوازی لە تۆپ (أخطاء المركز للفريق المستقبل)
- هەڵەکانی بەتۆڕ کەوتن بە شریتی سپی سەرەوە یان ڕاکیشانی تۆڕ بە ئەنقەست یان داری ئاسمانی (العصا الهوائية) لای خۆی.
- هەر بلۆك کردنی تەواو (صد المكتمل) بە ڕێگای یاریزانی ناوچەی دواوە یان هەولدان بۆ بلوك کردن لەلایەن یاریزانی بەرگری ئازاد (ليبرۆ).
- پێ کەوتنی تۆپ لە لەشیکی دەرەکی یان زەوی لە کاتی ناوبژیوانی یەکەم لە شێوەیەکە ناتوانی پێ کەوتنەکە بە تەواوی ببینی.
- پاش یاری وواژۆ لە سەر فورمی یاری دەکات.

### مادە -٢٥- نووسەر : ( المسجل )

#### ❖ شوێن: ( الموقع )

ئیش و کاری خۆی دەکات بە دانیشتن لە دوای مێزی نووسەر لە لای ناوبژیوانی دووەم بەرامبەر ناوبژیوانی یەکەم.

#### ❖ لێپرسراویەتییەکانی: ( المسؤوليات )

- پیش یاری هەلدەستی بە نووسینی بەیانات و زانیاری و ناوی یاریزانان و ژمارەیان و ڕاهینەران ...هتد هەروەها وواژۆی ڕاهێنەران و سەرۆکی تیپەکان وەردەگری.
- نووسینی زنجیرەی بنەرەتی یاریزانان هەر تیپ بە پێ ی پسوولەی زنجیرەی سووڕانەوەکە لە ڕاهێنەر وەردەگری.
- نووسینی ژمارە و ناوی یاریزانی بەرگری ئازاد (ليبرۆ).

#### ❖ لەکاتی یاری نووسەر هەلدەستی بە :

- نووسینی خالەکانی کە وەردەگیرێت وە دلنیا دەبێت لە بۆردی ئەنجامەکان کە بە تەواوی نوسراوە.
- چاودێری کردنی زنجیرەی سیرڤ لێدان بۆ هەر دوو تیپ ئاماژە دەکات بۆ ناو بژیوانان ڕاستەو خۆ لە هەر هەلەیەك ڕوو دەدات پاش لێدانی سیرڤ.
- نووسینی کاتەکانی پچراو (الاوقات المستقطعة) وە گۆڕانکاری یاریزانان وە چاودێری ژمارەکانی دەکات و ئاگاداری ناوبژیوانی دووەم دەکات.
- بە ناو بژیوانان ڕادەگەینی لە سەر هەر داواکارێك نایاسایی بێت.

- راگەیاندن بۆ ناوبژیوانان لە کۆتایی هاتنی گێمەکان و کۆتایی هاتنی هەر کاتی پچڕاوی هونەری (٨-١٦)خاڵ وە پاش گەیشتنی هەر تیپێك بۆ خاڵی (٨) هەشت لە گێمی پێنجەم.

- نووسینی گشت سزاکان.

- نووسینی هەر زانیارێك و رووداوێك بە پێ ی ڕێنمایی یەکان بەریگای ناوبژیوانی دووەم وەکو گۆرانکاری بێجگە (التبدیل الاستثنائي) و ماوەی چارەسەر کردن و راوەستانی یاری بۆ ماوەی درێژ. پچڕانی کارەبا.هاتنە ناو یاری جەماوەر ...هتد.

- نووسینی ئەنجامی کۆتایی وە وواژۆ دەکات.

**مادە -٢٦- یاریدەدەری نووسەر : ( مساعد المسجل )**

❖ **شوێنی (الموقع) :** ئیش و کاری خۆی جێ بە جێ دەکات بە دانیشتن لە تەنیشت نووسەر لە پشت مێزی نووسەر .

❖ **لێپرسراویەتییەکانی (المسؤولیات) :** .

أ) گشت گۆڕانکاری یەکانی یاریزانی بەرگری ئازاد (لیبرو) دەنوسێت .

ب) یارمەتی نووسەر دەدا لە ئیش و کارو بەڕێوەبردنی یارییەکە .

ج) ئەگەر نووسەر نەیتوانی بەردەوام بێت لە ئیش و کاری خۆی یاریدەدەری نووسەر دەبێتە نووسەر .

د) کاتی دەستپێکردنی و کۆتایی هێنانی کاتی پچراوی هونەری بە زەنگ ئاگاداردەکات و دەژمێرێت .

هـ) ووردبینی و سەرپەرشتی ناوبژیوانی بوردی ئەنجامی خاڵەکان دەکات .

**مادە -٢٧- چاودێری هێلەکان : ( مراقبوا الخطوط )**

**لێپرسراویەتییەکانی: ( المسؤولیات )**

❖ چاودێرانی هێل ئیش و کاری خۆیان ئەنجامدەدەن بەکار هێنانی ئالا درێژی و پانی (٤٠×٤٠)سم.

❖ ئاماژە دەکەن بۆ پێش خۆیان ئەگەر تۆپ بەناو یاریگا یان هیلەکانی بکەوێت.

❖ ئاماژە دەکەن بۆ دەرەوە ئالاکە بەرز دەکەنە ئەگەر تۆپەکە بکەوێتە دەرەوەی یاریگا.

❖ دەستیکی لەسەر ئالاکە دادەنێ ئەگەر تۆپ بە پەنجەکانی یان دەستی یاریزانی بەرگری بکەوێت و تۆپەکە بچێتە دەرەوەی یاریگا.

❖ ئالاکە بەرز دەکاتەوە ئەگەر تۆپ بە داری ئاسمانی (العصا الهوائیە) بکەوێت لە کاتی یاری.

❖ ئالاکە بەرز دەکاتەوە بۆ ئەو تۆپی کە سێرڤ لێدەر تۆپەکەی لە دەرەوەی داری ئاسمانی بڕوات کە دەکا دەرەوەی نێوان دوو داری ئاسمانی کە ئەویش دەکا ریگای هاتو چۆی تۆپ (خارج مجال عبور الكرة)

❖ هەلەکانی قاچی سێرڤ لیدەر ئەگەر لە سەر هێل بێت ئالاکە بەرز دەکاتەوە.

❖ هەروەها ئالاکە بەرز دەکاتەوە کە قاچی هەر یاریزانیك لە دەرەوەی یاریگا بێت (بێجگە لە سێرڤ لیدەر) لە کاتی سێرڤ لیدان.

## ماده -٢٨- ئاماژەکانی فەرمی : ( الاشارات الرسمية )

## ئاماژەی ناوبژیوان بە دەست : ( إشارات اليد الحكم )

دەبێ ناوبژیوانان روونی بکەنەوە بە ریگای ئاماژەکردن بە دەستەکان بۆ دیاری کردن هۆی فیکە لێدانەکانیان (تێدا روونی بکەن چۆنیەتی هەڵەکە فیکەی بۆ لێداوە یان هۆی راگرتنی یاری).

## پرسیارەکان و وەلامەکانی

پ١/ بەرزایی تۆر ٢,٤٠ م بۆ پیاوان و ٢,١٤ بۆ ئافرەتان ؟

وەلاَم/ بەرزایی تۆر ٢,٤٣ بۆ پیاوان و ٢,٢٤ بۆ ئافرەتان .

پ٢/ ئایا بەرزی دوو داری هەوایی چەند لەسەر تۆر دەبێت ؟

وەلاَم / دوو داری هەوایی (٨٠) سم لەسەر تۆرەکە دەبێت .

پ٣/ کێشی تۆپی بالە چەندە ؟

وەلاَم / کێشی تۆپی بالە (٢٦٠–٢٨٠) گرامە .

پ٤/ ئایا ژمارەی فانیلەکانی یاریزانان لە چەند تاکو چەندە ؟

وەلاَم / دەبێت ژمارەی فانیلەکانی یاریزانان لە (١–١٨) بێت.

پ٥/ هەر تیپێك (٢) دوو گێم بباتەوە ئەوە یارییەکە دەباتەوە ؟

وەلاَم/ هەر تیپێك (٣) گێم بباتەوە ئەوە یارییەکە دەباتەوە .

پ٦/ ئایا چەند یاریزان لەهەر گێم یاری دەکات وە چەند گۆرانکاری یاسایی لەو گیمە دەبێت؟

وەلاَم / (٦) شەش یاریزان لە هەر گێم یاری دەکات و (٦) شەش گۆرانکاری یاسایی دەبێت .

پ٧/ ئایا هەر تیپێك چەند ماف ئەوەی هەیە لە تۆپ بدات ؟

وەلاَم / هەر تیپێك ماف ئەوەی هەیە (٣) سێ چار لە تۆپ بدات ( بێجگە لە بلۆك)

پ٨/ ئایا سێرڤ دەبێ لە نێوان چەند چرکە لێبدرێ ؟

وەلاَم / سێرڤ دەبێ لە نێوان (٨) هەشت چرکە لێبدرێت .

پ٩/ ئایا هەر تیپ ماف وەرگرتنی چەند کاتی پچراوی هەیە لەهەر گێم وە ماوەی هەر کاتی پچراو چەندە ؟

وەلاَم/ هەر تیپ ماف وەرگرتنی (٢) دوو کاتی پچراوی هەیە لەهەر گیم وە ماوەی هەر کاتی پچراو (٣٠) سی چرکەیە .

پ١٠/ ئایا ماوەی حەسانەوە لە نێوان گشت گێمەکان چەند خولەکە ؟

وەلاَم / ماوەی حەسانەوە لە نێوان گشت گێمەکان (٣) سێ خولەکە .